# هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی

## جۆرەکانی، ڕێگاکانی توشبوون
## بڵاوبوونەوەی، خۆپاراستن، چارسەری

دکتۆر ابراهیم طاهر معروف
پسپۆری تەندروستی کۆمەڵ



# هەوكردنی جگەری ڤایرۆسی

## جۆرەكانی، ڕێگاكانی تووشبوون و بڵاوبوونەوەی، خۆپاراستن، چارەسەری


دانانی

دكتۆر إبراهيم تاهير معروف

پسپۆر لە تەندروستی كۆمەڵ

لێپرسراوی هۆبەی نەخۆشیەكانی ڤایرۆسی ونەخۆشیەكانی سێكسی

شوان كانبی أحمد

پسپۆری تەندروستی كۆمەڵ

لێپرسراوی یەكەی هەوكردنی جگەری ڤایرۆسی



١٤٣٥/٢٠١٥

## پیشکەشە :

به هەموو ئەو کەسانەی کەوا کرداری خۆ پاراستن ئەنجام دەدەن
تاوەکو خۆیان و خانەوادەو کۆمەڵگە بپاریزن لەو نەخۆشیانە

# پێشەکی

جگـەر تووشـی هـەوکردنی جۆراوجـۆری دەبێـت، بـەڵام ڕێـژەی ٩٨-٩٩% ی ئەم هەوکردنانە بە هۆی ڤایرۆسی جگـەرەوە دەبێت کـە ئێمـە لـەو پەرتووکەدا باسیان دەکەین و ناسراون بە (هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی).

کۆمەڵێکی تر لە ڤایرۆس هەن کە جگەری تووشی هەو کردن دەکـەن بـە ڕێـژەی ١-٢% ئـەمانیش بـریتین لـەو ڤایرۆسـانە( Cytomegalovirus, Epstein-Bar virus, Herpes Simplex virus, Yellow Fever virus)، ئەمانە هەم ڕێژەی توشبوونیان کەمەو لەهەمان کاتیشدا ڤایرۆسی تایبەت بـە جگەر نین و زۆر کاریگەریش نین بۆیە باسیان ناکەین.

هەوکردنی جگـەری ڤایرۆسـی نەخۆشـیەکی درمـی درێژخایەنـە و زۆر جۆری هەیە وبەڕێگەی جیاجیـا بڵاودەبێتـەوەو ڕێـژەی بڵاوبونـەوەی زۆربـەی جۆرەکانی لـە جیهانـدا بـەرزەو زۆربەشـیان ماکوتـەیان نیـە. لـە کوردسـتانی خۆشمان جۆرەکانی بەدی دەکرێت بـە ڕێـژەی جیاجیـا و خـەریکـە ڕێژەکـەی بـەرز دەبێتــەوە لەبـەر هەنـدێ هۆکـار لەمانـە: کردنـەوەی سـنوورەکان بـۆ گەشتیارو کارەکەری بیانی و هاتنەوەی هەنـدێ لـە خـەڵکانی خۆمـان کـە بـۆ ماوەیەك لە دەرەوە ژیاون و ئەگەری ئەوەیان لێـدەکرێت کـەوا هـەڵگری ئـەم ڤایرۆسانە بن، هۆکـارێکی تـر بریتیـە لـە بەرزبونـەوەی ئاسـتی بـژێوی خـەڵك وچوونە ناو ژیانی ڕابواردن و کاری فرەسێکسی وبەکارهێنانی مادەی هۆشبەر لـە ڕێگـەی دەرزی، هـەروەها بەرزبوونـەوەی ڕێـژەی کـرداری نەشـتەرگەری گشـتی ونەشـتەرگەری ددان ، بەمــەش ژمارەیــەکی زۆر لــە کیسـەی خـوێن بـەکاردێت و ژمـارەو جـۆری زۆریـش لـە دەزگـاو ئـامێرو کەلوپـەلی پزیشـکی

بەكاردێت كە هۆكاری گواستنەوەی ئەم ڤایرۆسانەن گەر جوان و ڕێك و دروست پاك نەكرێنەوەو مامەڵە لەگەڵ پاشەڕۆكان نەكرێت بە دروستی. ئەمانەو هەندێ هۆكاری تر كەوا پەیوەندی بە پاك وخاوێنی خواردن و دەست و ئاوی خواردنەوە هەیە كەوا دەبنە هۆی گواستنەوەی هەوكردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (ئەی و ئی– A, E).

بە مەبەستی پاراستنی كۆمەڵگەكەمان لەم نەخۆشیە ترسناكە و هۆشیاركردنەوەیان لە هۆكارەكان و ڕێگەكانی گواستنەوەو چۆنیەتی خۆپاراستن لەم نەخشیە بە پێویستمان زانی بە شێوەیەكی زانستیانەو بە كورتی و بەكوردی باسی ئەم نەخۆشیە بكەین بە هیوای سوود وەرگرتن و دووركەوتنەوە لە هۆكارەكانی.

د. ابراهیم تاهر مەعروف

هەولێر

٢٠١٤/٢/٢

# جگەر چییە؟

جگەر گەورەترین ڕژێنەی لەشە، کێشەکەی ١.٥ کیلۆگرام دەبێت، دەکەوێتە بەشی سەرەوەی لای ڕاستی سك ولە ژێر ناوپەنچکە وڕەنگیشی سوری تاریکە. کارەکانی زۆرن لەژمارە نایەن، گەر جگەر بوەستێت ئەوا دوای ٢٤-٤٨ کاتژمێر مرۆڤەکە دەمرێت.

**گرنگی جگەر لە ژیانی مرۆڤدا**

**جگەر کاری زۆر گرینگ ئە نجام دەدات لەوانە:**

١- شیکردنەوەو داکردنی (خزن) شەکری سادە بۆ گلایکۆجین بۆ کاتی برسیەتی.

٢- یارمەتی لابردنی ماددە کیمیاویە زیان بەخشەکان دەدات لە خوێن .

٣- هاوکاری هەرس کردنی خواردن دەدات بە هۆی دروستکردنی زەرداو.

٤- کۆکردنەوەی ڤیتامین و خۆراکی هەرس کراو .

٥- کۆکردنەوەی ووزە وئاسن .

٦- شیکردنەوەی چەوری.

٧- لەگەڵ زیاتر لە ٥٠٠ کاری تری وورد و گرنگ.






وێنەی ژمارە(١)؛ شوێنی جگەرو ئۆرگانەکانی دەوروبەری

**زەرتك ( زەردوویی ) الیرقان- Jaundice :**

نزیکەی ٨٥% زەردوویی بەهۆی توشبوونە بەیەکێك لە ڤایرۆسەکانی جگەرە، ١٥% بەهۆی هۆکارەکانی ترە.

زەرتك: یەکێکە لە نیشانەکانی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی ئەویش بریتییە لە زەرد هەڵگەڕانی پێست و سپێنەی چاو لە ئەنجامی بەرزبوونەوەی

ڕێـژەی مـاددەی بـیلیرۆبین (Bilirubin) لـە نـاو خـوێن، ئـەم زەردووییـەش هۆکاری زۆری هەیە : هەیانە پەیوەندی بەجگەرەوە نیە و هەیانـە پەیوەنـدی ڕاستەوخۆی بە جگەر هەیە.

**شێوەکانی زەردوویی:**

- زەردوویی گەر بـە هـۆی خێـرا و زۆر تێکشـکانی خڕۆکـە سـوورەکانی خوێن بێت ، جا ئەو تێکشکانەی خڕۆکە سوورەکانیش بەهەر هۆیـەك بێت، ئەو جۆرە پێی دەوترێ زەردوویـی پـێش جگـەر hemolytic or (pre hepatic jaundice)،
- زەردوویی گەر بـەهۆی زیـان پێگەیشـتنی خانـەکانی جگـەر بێـت بـە هەوکردنی ڤایرۆسی و میکرۆبەکانی تـر ئـەم جۆرەیـان پێـی دەوتـرێ زەردوویی ناو جگەر(hepatic jaundice)،
- گەر بەهۆی گیرانی بۆڕیچکەکانی زەرداوو نەگەیشـتنی زەرداو بـۆ نـاو ڕیخۆلەو مانەوەی لەناو جگەرو گەڕانـەوەو پـەرتبوونی بـۆ نـاو خـوێن بێـت، ئـەوا بـەو جۆرەیـان دەوترێـت زەردوویـی دوای جگـەر( post hepatic jaundice).

لەکاتی بونی زەردوویی بە هۆی هـەوکردنی جگـەر گۆڕانکـاری لـە بـڕو ڕێـژەی هەنـدێ مـاددەو ئەنزایمـەکانی نـاو خـوێن ڕوودەدات وەك:بـیلیرۆبین( Bilirubin) (S.GOT)، ( S.GPT)، ( Alkaline phosphate) ئەمانـەش بـە پێی ڕێژەیتوندی زەردویەکە دەگۆڕدرێن.







**وێنەی ژمارە (٢) : زەردویی لە سپێنەی چاو و پێستەو نینۆك**

## بەشی دووەم

# هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی ( Viral Hepatitis ) وجۆرەکانی

### مێژوی ئەم نەخۆشیانە :

مێـژووی ئـەم نەخۆشـیانە کۆنـە بەتایبـەتی جـۆری (A,B) وتـاوەکو دۆزینەوەی مایکرۆسکۆبی ئـەلیکترۆنی ئینجـا تـوانرا زۆربـەیان دیـاری بکـرێن وناویان بۆ دابنێن. دوایی باسی سالّی دۆزینـەوەی یەکـە بەیەکـەیان دەکـەین لەکاتی باسکردنی جۆرەکانیان.

**پێناسەکەی:**

نەخۆشیەکی گوازراوەی درمە هەموو تەمەن و ڕەگەزێك توشی دەبن، کاری ئەم ڤایرۆسە لە سـەر خانـەکانی جگـەرە وکاروچـالاّکی کـەم دەکاتـەوە سەرەڕای ئەو ماکانەی کە لە دوایی ڕودەدات.

نەخۆشیەکە خۆی دەنوێنیّ لـە ئـازار و ئاوسـانی جگـەر لـە ئـەنجامی چوونە ژوورەوەی جۆرێـك لـە جۆرەکـانی ڤایرۆسـی جگـەر وبرینـدار بـوون و تێکشکان ولەکارکەوتنی خانەکانی جگەر بۆ ماوەیـەك ، ودەرکـەوتنی هەنـدیّ نیشانەی تایبەت وەك شەکەت بون، تا، سك ئێشە، هێلەنج، ئارەزوونـەکردنی خـواردن، دوای چـەند ڕۆژێـك زەرد بـوونی پێسـت و سـپێنەی چـاو، گـۆڕانی ڕەنگی میز بە ڕەنگێکی وەك چا، وە لـە وانەشـە هـیچ نیشـانەیەکی نـەبێت و نـەخۆش هەسـت بـە هـیچ شـتێك نـەکات تـەنها لـە کـاتی پشـکنین بـەدیار دەکەوێت.

**حاڵەت و بارەکانی ئەو نەخۆشیە :**

پـێش چـوونە نـاو جۆرەکـانی ئـەم ڤایرۆسـە پێویسـتە جۆرەکـانی حاڵەتی نەخۆشیەکە بزانین کە ئەمانەن :

١- **حاڵەتی گومان لێکراو** (Suspected Case): بەشێوەی نەخۆشییەکی کتوپڕ دەردەکەوێت و بەم نیشانانە جیادەکرێتەوە: تایەکی مام ناوەندی توند، لاوازی وماندووبوونێکی زۆر، ئارەزووی خواردنی زۆر کەم دەبێتەوە، هێڵنج و ڕشانەوە، ژان لە لای ڕاستی سەرەوەی سك، لەگەڵ ئاوسانی جگەر و چەند ڕۆژێکیش دوای ئەمە ڕەنگی میز تۆخ و ڕەنگی پیساییەکەشی کاڵ دەبێت ئەو حاڵەتەش لەڕووی پەتاییەوە پەیوەستە بەحاڵەتی زەردوویی یان هەوکردنی ڤایرۆسی جگەر کە لە تاقیگەدا چەسپێنراوە هەروەها لەوانەیە زەردوویی لە (١٠%) حاڵەتە کوتوپڕەکان بەتایبەتیش لەلای منداڵان دەربکەوێت.

٢- **حاڵەتی شیاو** (Probable Case): ئەو حاڵەتەیە کەوا وێڕای بەرزبوونەوەی بێلیرۆبینی ناو خوێن (Increased serum Bilirubin) بۆیەی بێلیروبینی ناو پێشاویش (میز) بەرزەو پۆزەتیڤە دەردەچێت( Positive Urobilinogen in Urine) لەگەڵ زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر، وەك:

(S. GOT ,S .GPT& S .ALKALINE PHOSPHATASE )

٣- **حاڵەتی چەسپێنراو** (Confirmed Case): ئەو حاڵەتـە گومانلێکراوەیـە کـە پشکنینە سیرۆلۆجیەکەی پۆزەتیڤە بـەپێی جۆرەکـانی (A,B,C or E). واتـە پشکنینی خودی ڤایرۆسەکە لەناو خوێن پۆزەتیڤە.

## هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری Hepatitis Virus ( A )    ( HAV )

**مێژووی ئەم نەخۆشیەو دۆزینەوەی:** ئەم نەخۆشیە لەزۆر کۆنەوە هەبووەو لە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی بە یەکێك لە نەخۆشیە زۆر کۆنەکان دادەنرێت. بەڵام ڤایرۆسەکە لە ساڵی ١٩٧٣ لەلایەن زانا **Steven M. Feinstone** دۆزراوەتەوە.

نەخۆشیەکی توندی جگەرە کە زۆر بەخێرایی ئەتەنێتەوە بە هۆی هەوکردنی جگەر بە ڤایرۆسی **(A)**. ئەم ڤایرۆسە لە گروپی **(RNA)** لە خێزانی( **Picornaviridae** ) وە لە توخمی ( **Hepatitis A virus**) وەتیرەکەی ٢٧ نانۆمیترە ولە جۆری **(Hepatovirus)**ە.






**وێنەی ژمارە (٣) : شێوەی ڤایرۆسی هەوکردنی جگەر جۆری (A)**

ئەم نەخۆشیە لە هەموو جیهاندا بڵاوە بەتایبەتی لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان، بەتایبەتی تر ئەوانەی چڕی دانیشتوانیان بەرزەو نەخۆشیەکە تیایاندا نیشتەجێیە، هەروەها ڕێژەی توشبوون بەرزە لەو وڵاتانەی کە ڕێژەی خزمەت گوزاری وپاك وخاوێنیان نزمە. هەموو تەمەنێك دەگرێتەوە بە زۆری لەنێوان ئەو منداڵانەی لە قۆناغی سەرەتایدان. ئەگەر کەسێك یەك جار تووشی ڤایرۆسەکە بوو دژە تەنێك دروست دەبێت لە ناو لەشی کەسەکە و بەرگری پێ دەبە خشێت بەدرێژایی ژیانی.




**وێنەی ژمارە( ٤ ): دابەشبوونی جیۆگرافی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی ( A ) لە جیهاندا**

ساڵانە نزیکەی ١,٥ ملیۆن کەس توشی ئەم نەخۆشیە دەبن لە گشت جیهاندا.

نەخۆشی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری **(A)** نابێتە هۆی بنەسەیی ( درێژخایان- المزمن- **chronic liver disease**) تەنها بە دەگمەن نەبێت.

لە کارکەوتنی جگەر بەهۆی ئەم ڤایرۆسە زۆر دەگمەنە تەنها ڕێژەی ٠.5 % یە، ئەگەر ڕوشبدات پەیوەندی بە تەمەنەوە هەیە بە جۆرێك کە لە هەر ١٠٠٠ حاڵەتێك ٤ کەس دەمرێت لە منداڵان، بەڵام لە تەمەنی سەروی ٥٠ ساڵ بۆ هەر ١٠٠٠ حاڵەت ١٧ حالەتی مردن ڕودەدات . واتە

هەرچەند تەمەن بەسەرەوە بچێت توشبوونەکە توندتر دەبێت و ڕێژەی مردن زیاد دەکات.

لە عێراق ڕێژەی توشبوون بە جۆری (A) نزیکەی ٩٦%. ڕێژەی ١٠٠% لە شاری نەجەفەو کەمترینی ٨٥% لە شاری هەولێرە.

**نیشانەکانی نەخۆشیەکە:**

شەکەت بون، تا، سك ئێشە، هێڵەنج، ئارەزوونەکردنی خواردن، دوای چەند ڕۆژێك زەرد بوونی پێست و سپێنەی چاو، گۆڕانی ڕەنگی میز بە ڕەنگێکی وەك چا. ئەم نیشانانە زۆربەی پەیوەندی بە تەمەنەوە هەیە.

- دەرکەوتنی نیشانەی زەردوویی لە منداڵی تەمەن کەمتر لە ٦ ساڵ ڕێژەکەی کەمترە لە ١٠%.
- منداڵی تەمەن نێوان ٦-١٤ ساڵ ڕێژەکەی دەگاتە ٤٠-٥٠ %.
- تەمەن گەورەتر لە ١٤ ساڵ ڕێژەکەی دەگاتە ٧٠-٨٠%.

**ئاگاداریە:**

- مەرج نیە هەموو ئەو نیشانانە لە هەموو نەخۆشەکان دەرکەوێت.
- ئەم نیشانانە لە گەوران زیاتر دەردەکەوێت وەك لە منداڵان.
- ڕێژەی مردن لە گەوران زیاترە لە منداڵان.
- ٧٠% ی منداڵان نیشانەی زەردوویان لێ دەرناکەوێت.
- ٧٠% هەرزەکارو گەورە نیشانەی زەردوویان لێ دەردەکەوێت.
- زۆربەی توشبووەکان پاش ٢-٦ هەفتە بەتەواوی چاك دەبنەوە.
- ڕێژەیەکی کەمی توشبووەکان دەچێتە قۆناغی درێژخایەن ، یان دوای چەند مانگێك سەرهەڵدەداتەوە.

* مـاوەی کرکـەوتنی ڤایرۆسـەکە: مـاوەی کرکـەوتنی( ١٥ - ٤٥ ڕۆژە)، بەشێوەیەکی گشتی ٢٨ ڕۆژ دەخایەنێت.

**ماوەی کرکەوتن:** بریتی یە لەو ماوەیەی کە ڤایرۆسـەکە دەچێتە ناولـەش، تـا بەدەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشیەکە.

**ڕێگاکانی بلاوبوونەوەی ڤایرۆسەکە:**

ئـەو ڤایرۆسـە بەرگـەی گـەرمی وسـاردی وترشـی گـەدە دەگرێـت، هەروەها بەرگەی هەندێك لە پاككەرەوەكان دەگرێت، توانـای هەیـە بـژی بـۆ ماوەی چەند مانگێك لە ئاودا ئەگەر ئاوەکە بیٚ پاككەرەوە بوو.

ئـەم ڤایرۆسـە بـە ژمارەیـەکی زۆر لەگـەڵ پیسـایی نـەخۆش دێتـە دەرەوەی لـەش (٢-٣) هەفتـە پـێش دەرکـەوتنی نیشـانەکانی نەخۆشـیەکەو (٢) هەفتـەش دوای نیشـانەکان. بۆیـە بـە گواسـتنەوەکەی دەڵـێن ڕێگـەی پیسایی – دەم ( Fecal-oral -route ).

**بەم ڕێگایانە دەگوازرێتەوە.**

١- ڕێگای دەست بە پیسبوونی بە پاشەڕۆی نەخۆش (poor sanitation ).

٢- پیس بوونی ئاوی خواردنەوە بە پاشەڕۆی نەخۆش (واتە تێکەڵبوونی ئاوی خواردنەوە بە ئاوی پیسی ئاوەڕۆی ماڵان.( Poor sewage (management

٣- پیسبوونی ئاوو خۆراك بەهۆی مێشوولە و پاشەڕۆی نەخۆش.

٤- لە ڕێگەی خواردنی ماسی و گیانەوەرانی تـری نـاو ئـاو، گـەر ئاوەکـەیان پیس بوو بە پاشەڕوی نەخۆش.




**وێنەی ژمارە(٥): ڕێگاکانی پیسبوونی خۆراك بەم ڤایرۆسە**

٥- لە ڕێگەی سەوزەو میوە کە سەرچاوەی ئاوەکەی پاك نەبێت، یاخود باش نەشۆرابێتەوە.

کەواتە بەگشتی لەو شوێنانەی قەرەبالغی تیایەو پاکوخاوێنی تیانیەو ئاوی خواردنەوەو خۆراکی پیسە ئەو نەخۆشیە زۆربڵاوە.

٦- لە ڕێگەی هەڵسوکەوت کردن لە گەل کەسێکی توشبوو لەگەڵ گویَ نەدان بە پاك وخاوێنی دەست و ئاوو خواردن وکەل وپەلی خواردن.







**وێنەی ژمارە (٦): ڕێگاکانی گواستنەوەی ئەم ڤایرۆسە**

**ڕێگاکانی دەستنیشانکردن ئەمانەن:**

١- بەهۆی دەرکەوتنی نیشانەکانی.

٢- پشکنینی پیسایی بۆ دۆزینەوەی ڤایرۆسەکە پێش دەرکەوتنی نیشانەکان و لەدوای نیشانەکانیش بە هۆی دەزگا پێشکەوتووەکان.

دژەتەنی ڤایرۆسەکە دەردەکەوێت لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی تاوەکو (٣) مانگ دوای چاکبوونەوەی. Anti HAV I.gM و لە دوای (٣) مانگ دژەتەنی ڤایرۆسەکە دەردەکەوێت لە جۆری Anti HAV I.g G ئەمەش مانای بوونی بەرگری لەشە هەتا هەتایە دژی ئەو جۆرە ڤایرۆسە.

٣- پشکنینی خوێن بۆ زانینی ئاستی ئەنزیمەکانی جگەر.

**ڕێگاکانی خۆ پاراستن لەم ڤایرۆسە:**

**یەکەم:** کوتان (Active immunity) بە ماکوتەی جۆری (Havrix)

بە کوتان دەتوانیت خۆت بپارێزیت بە ڕێژەی ٩٥% ، ماکوتەکە دوای یەك مانگ کار دەکات.

**ئەو ماکوتەیە بە کێ دەدرێت؟**

- ئەوانەی نەخۆشی ترسناکی وەك شێرپەنجەیان هەیە.
- ئەوانەی ئەو نەخۆشیانەیان هەیە کەوا بەرگری لەش کەم دەکەنەوە وەك ئایدز.
- ئەوانەی دەرمانی کۆرتیزۆن بەبەردەوامی وەردەگرن.
- ئەوانەی نەخۆشی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی بنەسەیان هەیە لە جۆری ( بی و سی– B ,C) بەمەرجێ پێشتر توشی جۆری (ئەی

نەبووبن).پاش ئەنجامدانی پشکنینی (Anti HAV Ig G) بۆیان.

- لەماوەی (٢) هەفتە پێش بەرکەوتن لە کاتی هەڵسوکەوت لەگەڵ توشبوو یان کاتی بڵاوبوونەوەی پەتا.
- بەوانەی گەشت دەکەن بۆ ئەو وولاتانەی ئەو نەخۆشیەیان تێدا بڵاوە، یەك مانگ پێش سەفەرەکە.
- ئەوانەی نەخۆشی تری جگەریان هەیە یان زەرتکی درێژخایەنیان هەیە، پێشتر توشی جۆری (ئەی نەبوو بن).
- ئەوانەی نەخۆشی هیمۆفیلیایان هەیە.
- ئەوانەی لە شوێنی زۆر ترسناك کار دەکەن و پێشتر توشی جۆری (ئەی نەبووبن).

ماکوتەیەکی بێ زیانەو بەرێگای دەرزی لێدان لێدەدرێت لە تەمەنی (١-١٨) ساڵ بۆ منداڵان بە بڕی (٠,٥ س س)، لە تەمەنی ١٩ ساڵ بەسەرەوە بۆ تەمەنی گەورە(١ س س) لە ماسولکە دەدرێت بە دوو ژەم نێوانیان کەمتر نەبێت لە ٦ مانگ.

دەتواندرێت لە کاتی بڵاوبونەوەی پەتاکە بەکاربهێنرێت، هەروەها لەو وولاتانەی سەرچاوەی ئاوی خواردنیان پاك نیە یان خزمەتگوزاریان کەمە، بەکار دەهێندرێت.

**سیرەمی بەرگری (ئیمیونۆگلۆبیولین– Immune Serum Immunoglobuline (Passive immunity)**

- ئەوانەی بەرکەوتەی ڤایرۆسەکەن پێویستە لە ماوەی دوو هەفتە پێبدرێت لەگەل ماکوتەکە.
- بەساڵاچوان.
- ئەوانەی نەخۆشی قورسیان هەیە، وەك شێرپەنجە.
- ئافرەتی دووگیان.
- لەکاتی بڵاوبوونەوەی پەتاکە لە ناوچەیەك.

**ماوەی کارکردنی ماکوتەکە:**

ماکوتەکە ماوەی ١٥-٢٠ ساڵ کاریگەری دەمێنێت لە منداڵان و لە گەوران زیاتر لە بیست ساڵ.





**وێنەی ژمارە (٧): چۆنیەتی کوتان بە ماکوتەی جۆری ( A )**

**دووەم:** باش کردنی سەرچاوەی ئاو یاخود کوڵاندنی یان کلۆر تێکردن .

**سێیەم:** دڵنیابوون لە خواردنی سەوزەو میوەو خۆراکی پاك.





**وێنەی ژمارە (٨): سەوزەو میوەو خۆراکی پاك**

**چوارەم:** باش کردنی ئاوەڕۆ(المجاري- **sanitation**).



**وێنەی ژمارە (٩): ئاودەستی پاك**

**پێنجەم:** دەست شوشتن پێش خواردن و دوورکەوتنەوە لە خواردنی پیسەوەبوو.



**وێنەی ژمارە (١٠): دەست شوشتن پێش خوادن**

**شەشەم:** رێنمایی و ئامۆژگاری سەبارەت بە سروشت و رێگای بڵاوبونەوەی ڤایرۆسەکە (هۆشیاری تەندروستی).

**حەوتەم:** پێدانی دژە تەن بەوانەی بەرگریان کەمە وەك منداڵ وبەساڵاچوو.

**هەشتەم:** جیاکردنەوەی نەخۆش لەماڵەوە یان لە نەخۆشخانە.



**وێنەی ژمارە (١١): رێگاکانی خۆپاراستن لەم نەخۆشیە**

**دەرەنجامی ئەم نەخۆشیە :**

دەرەنجامی ئەم جۆرەیان زۆر باشە و نەخۆشەکان زۆربەیان چاك دەبنەوەو زۆر بەدەگمەن توشی لەکارکەوتنی توندی جگەر دەبن ( Acute Hepatic Failure)، قۆناغی دریژخایەن و بنەسەیی بەدەگمەن ڕوودەدات.

**چارەسەری نەخۆشیەکە:** پێویستە کەسەکە پشووی تەواوی پێبدرێت، خواردنی شلەمەنیەکان وەك (شۆربا )بخوات و ژەمەکانی بەیەکسانی دابەش بکرێت، زیادکردنی خواردنی شیرنی سروشتی وەك خورماو هەنگوین، دوورکەوتنەوە لەخواردنی چەورو قورس، هەروەها جێنشین بکرێت لە ژورێکی ڕوناکی فێنك لەماڵەوە. گەر لە داینگە بوو یان قوتابی بوو لە قوتابخانە دوور دەخرێتەوە وپشووی پێدەدرێت بۆ ماوەی (٢) هەفتە. گەر باری تەندروستی بەرەو کزی چوو، ئەوا لە نەخۆشخانە دەخەوێنرێ بۆ وەرگرتنی شلە لە ڕێگەی خوێن و دەستکردن بە ئەنجامدانی ئەزمایشتی جۆراوجۆر بۆ دیاری کردنی جۆری ڤایرۆسەکەو دیاری کردنی نەخۆشی تر. دەتوانرێ ماکوتەی (Immunoglobulin) وەربگرێت.



**وێنەی ژمارە (١٢): پشوودانی توشبووەکە**

## هەوكردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری Hepatitis Virus( E )

ئەم جۆرەیان هەستی پێكرا لە هندستان لە ساڵی ١٩٧٨ لە شاری نیودەلهی پاش ئەوەی ژمارەیەكی زۆر لەخەڵك توشبوون بە پەتای زەردویی و هەوكردنی جگەر. لە ساڵی ١٩٨٣ دووبارە خەڵكانێكی زۆر لە ناوچەی كشمیر توشیان بە هەمان پەتا هات، لە هەمانساڵ ڤایرۆسەكە دیاری كرا لە لایەن زانا M.S Balayn و ناوی دانرا بە (E).

ماوەی كڕكەوتنی ڤایرۆسەكە: ( ١٥ - ٤٥ ڕۆژە)، بەشێوەیەكی گشتی (٢٨) ڕۆژ دەخایەنێت.

ئەو جۆرەیان لە جۆری یەكەم دەچێت لە ڕووی گواستنەوەو خۆپاراستن و چارەسەر بۆیە دووبارەی ناكەینەوە، تەنها چەند جیاوازیەكیان هەیە ئەویش ئەمانەن:

١- جۆری (E) زیاتر تووشی تەمەنی هەرزەكارو گەورە دەبێت، بەلام جۆری (A) زۆربەی زۆری لە منداڵی خوار تەمەنی (٥) ساڵیە.

٢- جۆری (E) كاتێ توشی ئافرەتی دوو گیان دەبێت ڕێژەی مردن تیایدا بەرزەو دەگاتە ٢٠%.

٣- جۆری (E) بەرگری ئەكتیف و پاسیڤی نیە ، واتە نە ماكوتەی هەیەو نە سیرەمی بەرگری (Active & Passive immunity)

## هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (H BV)Hepatitis Virus (B)

**مێژووی ئەم نەخۆشیە ودۆزینەوەی:** زانا (Lurman) لە ساڵی ١٨٨٥ هەستی کرد ژمارەیەکی زۆر لەو کارمەندانەی کە ماکوتەیان وەرگرتووە بە دەرزی پیسبوو توشی نەخۆشی هەوکردنی جگەر هاتوون. بەڵام دۆزینەوەی ڤایرۆسەکە لە ساڵی ١٩٦٣-١٩٦٥ بووە لەلایەن زانای دکتۆر (Baruch Blumberg). لەساڵی ١٩٧٠ زانا (D.S.Dane) پارچەکانی ئەم ڤایرۆسەی دۆزیەوە و لەساڵی ١٩٨٠ ماکوتەی ئەم نەخۆشیەش دروستکرا.

ڤایرۆسێکە پەلاماری جگەر دەدات ولە چالاكیەکانی کەم دەکاتەوە ودەبێتە هۆی نەخۆشیەکی توندی جگەر ( Acute Hepatitis) یان نەخۆشیەکی درێژخایەنی جگەر( Chronic Hepatitis). ڕێژەیەکیش لەمانە ئەنجامەکەی یان بە شەمیٚ (مۆم) کردنی جگەرە(liver cirrhosis) یان شێرپەنجەی جگەرە (Hepatocellular carcinoma)، هەندیٚ جار دەبێتە هۆی پەککەوتنی جگەر(Liver damage & Failure) .

ڤایرۆسی جۆری (B) سەر بە خێزانی ( Hepa DNA Virus) تیرەکەی (٤٣) نانۆمەترەو بە پەردەیەکی (٧) نانۆمەتری داپۆشراوە. ئەم ڤایرۆسە (٣) جۆر ئەنتیجینی هەیە:

١- (ئەنتیجین)ی ڕووکەشی ڤایرۆسەکە (HBsAg)

٢- (ئەنتیجین) ی ناوەوەی ڤایرۆسەکە (HBcAg)، تەنها لەناو خانەکانی جگەردا دەبینریٚ.

٣- (ئەنتیجین) ئی (HBeAg ) کە بە شێکە لە HBcAg.







وێنەی ژمارە (١٣) : شێوەی ڤایرۆسی هەوکردنی جگەر جۆری (B)و نەنتیجینەکانی

ئەم جۆرە هەوكردنـە هـەموو تەمەنـەكان دەگرێتـەوە بـە پێـی سـەر ژمێری ساڵی ٢٠١٠ زیـاتر لـە ٥٠٠ ملیـۆن كـەس هـەڵگری ئـەم ڤایرۆسـەن، ساڵانە یەك ملیۆن كەس دەمرێت و ساڵانە (٤) ملیۆن حالـەتی تـازەش تۆمـار دەكرێت.

ڕێژەی ٨% توشبوون لە منداڵان و هەرزەكاران لە ناو كۆمەڵگەی هەر وولاتێك مانای بەرزی ڕێژەی بڵاوبوونەوەیە.

ڕێژەی ٢-٧% توشـبوون لـە گشـت تـەمەنـەكان مانـای مـام ناوەنـدی ڕێژەی بڵاوبوونەوەیە.

ڕێژەی كەمتر لە ٢% توشبوون لـە نـاو چینی گـەنجان مانـای نزمـی ڕێژەی بڵاوبوونەوەیە.




**وێنەی ژمارە (١٤): ڕێژەی بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشیە لە جیهاندا**

لە عێراق نزیکەی ١.٦% بۆ جۆری (B). بەرزترینی لە شاری (النجف) کە ٤% و کەمترینی لە شاری (المثنى) کە ٠%. لە ئێران زیاترە لە ١.٧%.




**وێنەی ژمارە (١٥) : ڕێژەی بڵاوبوونەوەی لە ساڵی ٢٠٠٥-٢٠١١ لە عێراقدا**

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە:**

شەکەت بون، تا، هێڵەنج، ئازاری بەشی سەرەوەی لای ڕاستی سك، ئارەزوونەکردنی خواردن ، زەرد بونی پێست و سپێنەی چاو، گۆڕانی ڕەنگی میز بە ڕەنگێکی تۆخی وەك چا، ڕەنگاو ڕەنگ دەرکەوتنی ڕواڵەتی نەخۆش. ڕێژەیەکی زۆر کەم لە نەخۆشەکان بە نیشانەکانیەوە دەدۆزرێتەوەو دیاری دەکرێن بەتایبەتی لە منداڵان کە کەمترە لە ١٠% و لە تەمەن گەورەکانیش ٣٠-٣٥% نیشانەکانیان لەسەر دەردەکەوێت. ڕێژەی مردنیش بەهۆی هەوکردنی توندەوە کەمە ١% بەتایبەتی لەوانەی لە سەروی ٤٠ ساڵیدان. واتە لە منداڵان ڕێژەی دەرکەوتنی نیشانەکانی کەمە بەڵام چوونە قۆناغی درێژخایەنیان بەرزە. لە گەورەکان ڕێژەی دەرکەوتنی نیشانەکانی

بەرزە بەڵام چوونە قۆناغی درێژخایەنی نزمە.

هەوکردنی زۆر توندو ترسناك لە ئافرەتی دووگیان دەردەکەوێت یان لەو منداڵانەی دایکیان تووشبووەو لەدایك دەبن بە شێوەیەکی ئاسایی (الولادة الطبيعية) بە ڕێژەی ٩٠% گەر ماکوتەو دژەتەن لە منداڵەکە نەدرێت لە یەکەم ڕۆژی لە دایکبوونی واتە (لە ماوەی ٢٤ کاتژمێری یەکەمی دوای لە دایکبوون).

**ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسەکە:**

ماوەی ٣٠ بۆ ١٨٠ ڕۆژە بەشێوەیەکی گشتی ٩٠ ڕۆژە، کەمترینی (٢) هەفتەیەو زۆرترینی ٦-٩ مانگە.

کورتی ودرێژی ماوەی کرکەوتن لەسەر (٣) خاڵ دەوەستێ:

١- ژمارەی ڤایرۆسەکانی ناو خوێن.

٢- ڕێگەی گواستنەوەکەی.

٣- باری تەندروستی ئەو کەسەی توشبووە.

دەتواندرێت لە ماوەی ٣٠ بۆ ٦٠ ڕۆژ ڤایرۆسە کە دیاری بکرێت یان بدۆزرێتەوە لەناو خوێن و شلەکانی لەش بە ئامێری تایبەت، وەك : ELISA method، Western Blot ، Mini Vidal ، PCR ، IFA

**ماوەی تووشکردن:**

١- نەخۆشەکە هەفتەیەك پێش دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشیەکە و بەدرێژایی قۆناغی توند(Acute stage) خەڵك توشدەکات. بەتایبەتی لەو کاتەی کەوا ئەنتیجنی (HBsAg) لەناو خوێندا هەیە.

٢- له قۆناغی درێژەخایەنیش (Chronic stage) خەڵکی توشدەکات و دەوەستێ لەسەر بوونی ئەنتیجینی (HBV DNA , DNA HBeAg Polymerase,) ورێژەکەی . گەر رێژەیان بەرز بوو ئەوا رێژەی توشبوونی بەرزە بەلام بە پێچەوانەوە گەر رێژەیان نزم بوو وە دژەتەنی (anti-HBeAg) بەرز بوو ئەوا کەمتر خەڵك تووشدەکات.

***( واتە لە دەرکەوتنی نیشانەکانی تاوەکو مردن خەڵك تووشدەکات بە رێژەی جیاجیا ) .***

**ئالۆزیەکان ( complications )**

ئالۆزیەکان لە هەوکردنی ڤایرۆسی جۆری (B) بەم جۆرەیە:

هەوکردنی درێژخایەن (Chronic hepatitis) رێژەی ١٠-٢٠% خەڵکانی ئاسیا توش دەبن دەبنە هەڵگری ڤایرۆسەکەو رێژەی ٢% دانیشتوانی ئەورپاو ئەمەریکا دەچنە ئەم قۆناغەوە. لەوانەیە ئەم هەڵگرانە بەبێ نیشانە بمێننەوە و لەوانەشە ئەو دەرەنجامانەی لێبکەوێتەوە کە بریتیە لە:

١- رێژەی ١٥-٢٠% دەبێتە هۆی بە شەمێ بوون (مۆم بوونی) جگەر ( Liver cirrhosis) ئەویش لە ماوەی ٥-٢٠ ساڵ، بەلام لە مندالان خیراترەو ترسناکترە ولە ماکە خراپەکانی ئەو بەشەمێ بوونە وەك ئاوسانی وورگ (Ascitis) وئاوسانی قاچەکان (Leg odema).

ئەوانەی زیاتر لە یەك ملیۆن کۆپی ڤایرۆسیان هەیە / ١ میللتر خوێن (1million copies/ml)ئەوانە زیاتر توشی بەشەمێ بوون دەبن لە ماوەی چەند ساڵێکدا. بەلام ئەوانەی قورسایی و لۆدی ڤایرۆسەکەیان کەمتر لە ٣٠٠ کۆپی ڤایرۆس/ ١ میللتر ئەوا تەنها بە رێژەی 4.5% تووشدەبن.

٢- شێرپەنجەی خانەکانی جگەر( Hepatocellular carcinoma) .




وێنەی ژمارە (١٦): بەشەمیٚ بوونی جگەر بە بەراورد لەگەڵ جگەری تەندروست





وێنەی ژمارە (١٧): ئاوسانی وورگ بە هۆی کۆبوونەوەی ئاو تیایدا (Ascitis) و شێرپەنجەی جگەر

هەوكردنی درێژخایەن پەیوەندی زۆری بەتەمەنەوە هەیە:

- ڕێژەی توشبوون بە هەوكردنی درێژخایەن لە منداڵی تەمەن كەمتر لە یەك ساڵ دەگاتە ٩٠% .
- لەتەمەنی ١-٥ ساڵیدا دەگاتە ٢٠-٥٠% .
- لە هەرزەكارو كەسێكی تەمەن گەورە ١-١٠% .
- بە شێوەیەكی گشتی ڕێژەی ٨-١٠ % ئەوانەی توشبوون چوونەتە قۆناغی درێژخایەن .
- ئەوانەی نەخۆشی داوون سندرۆم و ئەیدز، یان نەخۆشی گلاندەلیمفاویەكانیان هەیە زیاتر دەچنە قۆناغی درێژخایەنەوە.
- ڕێژەی ١٥ - ٢٥ % ی ئەوانەی توشبوون بە هەوكردنی درێژخایەن ئەوا توشی ئالۆزیەكان دەبن كە بەشمیٚ بوون وشێرپەنجەی جگەرە.

ڕێژەی مردن لە سەرەتاوە كەمە ٠.٥ - ١ % ، بەڵام گەورەیی تەمەن و بونی ڤایرۆسی جۆری (C) و ڤایرۆسی(HIV) كاریگەری زۆری هەیە لەسەر بەرزبوونەوەی ڕێژەی مردن.

- ٨٠% شێرپەنجەی جگەر بەهۆی توشبوونی ئەم ڤایرۆسەیە.

### ڕێگاكانی گواستنەوە:

هەموو شلەكانی لەش وشانەو ئەندامەكان هۆكارن بۆ گواستنەوە وەك: (خوێن ولیك وئاوی پیاوو ژن وئەندامەكانی). بوونی ئەنتیجین یان بوونی پارچەكانی ڤایرۆسەكە و (DNA) لەسەروی ١٠ ^٥ جووتە/ مل^٣ خوێن مانای بوونی ژمارەیەكی زۆری ڤایرۆسەكەیە لەناو شلەو شانەكانی لەش.

١- كەسێك بەركەوتەی ڕاستەوخۆی خوێنی كەسێكی توشبوو بێت بە

ڕێگەی دەرزی ناو خوێن یان ماسولکە یان ژێر پێستە . ئەو ڤایرۆسە بەرگریی بەرامبەر بارودۆخ هەیە بۆ ماوەی (١٢) کاتژمێر وتاوەکو (٧) ڕۆژ توانای هەیە بە زیندوویی بژی لە دەرەوەی لەش. بۆیە پێویستە زۆر ئاگاداری بەرکەوتنی خوێنی نەخۆش بین.

٢- کاری سێکسی بەتایبەتی فرە سێکسی. گواستنەوەی لە پیاوان بۆ ئافرەتان (٣) بەرامبەری گواستنەوەی لە ژنانە بۆ پیاوان.



**وێنەی ژمارە (١٨): سەرەتاکانی پەیوەندی سێکسی**

٣- گواستنەوەی خوێن بە تایبەت ئەوانەی نەخۆشی درێژخایانی خوێنیان هەیە و بەردەوام خوێن وەردەگرن، وەك (تالاسیمیا..... هتد)

٤- بەکارهێنانی دەرزی پیس یان هەر ئامێرێکی بواری پزیشکی پیس بوو.

٥- هەندێك ڕێگای تر وەك (کەرستەی ڕیشتاشین، بەکارهێنانی فلّچەی کەسێکی توشبوو، تاتۆکردن). دەبێتە هۆی گواستنەوەی ئەو نەخۆشیە لە نێوان ئەندامانی خێزان.



وێنەی ژمارە (١٩): تاتۆکردن

٦- لە ڕێگەی دایکەوە بۆ منداڵ لە کاتی منداڵبووندا. بەتایبەتی ئەو ئافرەتانەی ئەنتیجینی جۆری (HBeAg) یان لە ناو خوێندا هەیە ڕێژەی گواستنەوە بۆ منداڵەکەی سەروی ٧٠%، ئەوانەی ئەو ئەنتیجینەیان لەناو خوێندا نیە ئەوا ڕێژەی گواستنەوە بۆ منداڵە کەمترە لە ١٠%.

٧- لە کاتی کارکردن وەك نەشتەرگەری گشتی و ددان وبرینپێچی وئەوانەی کار لەگەڵ خوێن دەکەن لە تاقیگەو شوشتنی گورچیلە.



له دایکێکی توشبوو بۆ کۆرپەکەی | بەکارهێنانی دەرزی پیسبوو | گواستنەوەی خوێن

## هۆکاری توشبوون بە هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی B& C





کاری سێکسی ناشەرعی | تاتوو کردن | سمین یان کونکردن

وێنەی ژمارە (٢٠): ڕێگەکانی گواستنەوەی جۆری (B, C)

**کۆمەڵەی ترسناکی کێن : واتە ئەوانەی زیاتر ئەگەری توشبوونیان هەیە**

١- ئەوانەی دەرزی پیسبوو بەکاردێنن بۆ ماددە هۆشبەرەکان( IDU s).

٢- ئەوانەی کاری فرەسێکسی دەکەن لەگەڵ ئافرەتان.

٣- ئەوانەی نێربازی دەکەن.

٤- ئەوانەی لە نەخۆشەکەوە نزیکن وهاوسەرگیرن.

٥- کارمەندانی تەندروستی.

٦- ئەوانەی شوشتنی گورچیلەیان هەیە.

٧- ئەوانەی ڕووبەڕووی هەڵەی پزیشکی دەبنەوە وەك بەرکەوتنی دەرزی و چەقۆو موسی نەشتەرگەری.

٨- ئەوانەی کەل وپەلی پیسبوو بەکاردێنن لەکاتی سەرتاشین و تاتۆکردن، وەك: موس و دەرزی وشتی تر.

٩- ئەوانەی ژیانیان لەگەڵ کەسێکی توشبوو دەبەنە سەرو خۆیان نەکوتایە.

**دەست نیشانکردنی :**

شیکردنەوەی پشکنینەکانی هەوکردنی ڤایرۆسی جۆری (B) لەناو خوێن، بۆ دەست نیشانکردن ودۆزینەوەی قۆناغەکانی

١- ئەنتیجینی ڕووکەشی ڤایرۆسەکە( HBsAg ). ئەو ئەنتیجینە لە لەماوەی کرکەوتندا لە قۆناغی توندا پێش هەموو ئەنتجینەکانی تر دەردەکەوێت و لە خوێن دەمێنێتەوە تاوەکو قۆناغی پێش چاکبوونەوە واتە بۆ ماوەی (٥) مانگ. لە هەندێ حالەتدا پاش چەند ڕۆژێك وون بێت پێش دەرکەوتنی زەرتك، لەوانەشە ٣-٤ هەفتە بمێنێ.

دەرکەوتنی لەناو خوێن مانای ئەوەیە نەخۆشەکە توشی ئەم ڤایرۆسە بووە، وە لە قۆناغی درێژەخایەنیشدا بەبەردەوامی هەیە لەناو خوێندا. واتە ئەوانەی ( HBsAg ) و (anti-HBcAg) یان پۆزەتیڤە بۆ ماوەی زیاتر لە (٩) مانگ ئەوە دەگەیەنێ ئەوا ئەو کەسانە بوونەتە هەڵگری درێژخایەنی ڤایرۆسەکە.

هەر لە سەرەتاوە لەشی نەخۆشەکەش بەرگری بۆ ڤایرۆسەکە دروست دەکات دژە تەنێك دروست دەبێت بەناوی (anti-HBs )، بەڵام لەدوای ٣-٦ مانگ لە خوێن بەدیار دەکەوێت و بۆ ماوەی چەند ساڵێك دەمینێ یان هەر بەردەوام دەمینێ. بوونی ئەم دژە تەنە، واتە لەش بەرگری بۆ ڤایرۆسەکە پەیدا کردووە.

٢- ئەنتیجنی ناوەوە (HBcAg) لەناو خوێن نابینرێ بەڵکو لەناو خانەکانی جگەردایە، بەڵام دژە تەنی ناوەوە (anti-HBc ) کە دوو جۆری هەیە (IgM, IgG)، جۆری ( anti-HBc IgM ) لە سەرەتای نەخشیەکە لە خوێندا دەردەکەوێت بۆ ماوەیەکی کورت و دوایی جۆری (anti-HBc IgG ) دەردەکەوێت بۆ ماوەی چەند مانگێك.

بوونی جۆری anti-HBc IgM بە ڕێژەیەکی بەرز لەناو خوێن لەگەڵ ( HBsAg ) مانای بوونی هەوکردن توندە، بوونی جۆری anti- IgG HBc بەتەنها مانای بەرەو چاکبوونەوەیە، بەڵام بوونی ئەم جۆرەیان لەگەڵ ( HBsAg ) واتە چوونە قۆناغی درێژخایەنە.

٣- دیاری کردنی ئەنتیجنی (HBeAg) و دژە تەنەکەی (anti-HBe ). بوونی (HBeAg) مانای توندی وبەرزی هەورکردنەکەیەو ڤایرۆسەکان بە خێرایی زیاد دەکات وخەڵکان بە ئاسانی توش دەکات گەر ئەو خوێنەیان بەرکەوێت. بوونی دژەتەنی (anti-HBe ) مانای کەمی دابەشبوونی ڤایرۆسەکانەو کەمتر خەلك توشدەکات. هەردووکیان لە قۆناغی درێژخایەندا لە خوێن دەبینرێن.

## ئەم خشتەی خوارەوە ڕاڤەی پشکنینەکان دەکات

**ڕاڤەکردنی پشکنینەکانی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (B)**

| | | Anti HBc | | |
|---|---|---|---|---|
| ڕاڤەکردن | HBsAg | IgM | IgG | Anti-HBs |
| لە ماوەی کرکەوتندا | + | + | - | - |
| لە کاتی هەوکردنی توند | | | | |
| سەرەتای نەخۆشیەکە | + | + | - | - |
| حالەتەکە چەسپاوە | + | + | + | - |
| بەرەو چاکبوونەوە | | | | |
| ٣-٦ مانگ دوای بەرکەوتن | - | - | + | -+ |
| ٦-٩ مانگ دوای بەرکەوتن | - | - | + | + |
| یەک ساڵ دوای توشبوون | - | - | + | + |
| چوونە قۆناغی درێژخایەن | + | | + | - |
| بەرگری هەیە چونکە پێشتر ماکوتەی وەرگرتووە | - | - | - | + |
| بەرگری هەیە چونکە پێشتر توشبووە وچاکبووتەوە | - | - | + | + |

نەخۆشەکان پێویستە لە ساڵی یەکەمدا ٢-٣ جار ئەو پشکنینانەی بکرێت ، و دوایی هەر ساڵێك یەکجار دووبارە دەکرێتەوە تاوەکو باری توند هەوکردنەکردنەکە بزانین.

ئەو دەزگاو ڕێگایانەی بەکاردێت بۆ دەستنیشانکردنی ئەو جۆرە نەخۆشیانە ئەمانەن: ELISA method، Western Blot، Mini Vidal، PCR،IFA

پشکنینی PCR ، کاتی ئەنجامدانی دەتوانێ HBV DNA ی ڤایرۆسەکەمان بۆ هەژمار بکات، دەتوانرێ سوودی لێوەربگرین پاش وەرگرتنی دەرمانی چارەسەر تاوەکو بزانین ئەم چارەسەرە زۆربوون و دابەشبوونی ڤایرۆسەکەی ڕاگرتووە یان نە، واتە نەخۆشەکە سوودی لە دەرمانەکان وەرگرتووە یان نە..

**ڕێگاکانی خۆپاراستن:**

**یەکەم: کوتان**

ماکوتەی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی لە ساڵی ١٩٨١ ەوە بەکاردێت و پێکهاتووە لە یەکێك لەو پرۆتینانەی کە لە دەرەوە ڤایرۆسەکەی داپۆشیوەو ناسراوە بە (HBsAg) وەردەگیرێت لە پلازمای خوێنی نەخۆشەکان یان (DNA) ڤایرۆسەکە بە کردارێکی تایبەت دەخرێتە ناو (DNA) بەکتریاو کەڕوەکان و لەوێ گەشە دەکات ودوایی وەردەگیرێتەوەو دەکرێت بە ماکوتە.

کاتێ ئەو ماکوتەیە چووە ناو لەشی کەسە کوتراوەکە ئـەوا دژە تـەن دروست دەبێت بۆ پرۆتینی ڤایرۆسەکە (HBsAg) وئەو دژەتەنە پێی دەڵێن .(anti-HBsAg)

جۆرەکانی کە لە بازاڕەکانەوە هەیە ئەمانەن:

لە زۆربەی وولاّتان بەکاردێت ,Engerix-B (GSK)

**Elovac B (Human Biologicals Institute, A division of Indian Immunologicals Limited), Genevac B , Serum Institute , Shanvac B .**

لـە سـاڵی ١٩٩١ ڕێکخـراوی تەندروسـتی جیهـانی داوای لـە وولاّتـان کردووە کەوا ماکوتەی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی بـەکار بهێـنن و لـە سـاڵی ٢٠٠٠ نزیکـەی ١١٧ وولاّت بەشـداری کـردووەو منـداڵانی خۆیـان دەکـووتن، بەمەش ڕێژەکەی کەم دەبێتەوە لە ٨% بۆ ١% لە منداڵان.

(کوتان گرینگی زۆر زۆری هەیە لە کەمکردنەوەی ڕێژەی توشبوون بە ڤایرۆسەکە). ماکوتەی (B) بۆ هەموو تەمەنەکان پێویستە چونکە پارێزگاری دەکات لە توشبوون بە ڕێژەی ٩٠%، وە کاریگەر دەبێت بۆ ماوەی نزیکەی ١٥ ساڵ یان زیاتر. بەسێ ژەمی جیا دەدرێت(٠,٥ مل= ١٠مایکروگرام بۆ منداڵان) و(١مل= ٢٠ مایکرۆگرام بۆ تەمەنی گەورە) و (٤٠ مایکرۆگرام بۆ ئەوانەی شوشتنی گورچیلەیان هەیە) هەر ژەمێك بە ڕێگای لێدانی ماسولکە، کە ژەمی (سفر) بۆ دروستکردنی بەرگریە بە ڕێژەی ١٠% ، لە دوای یەك مانگ ژەمی (یەك) بۆ دروستکردنی بەرگری بە ڕێژەی ٧٥% وە ژەمی (دوو) دوای شەشە مانگ بۆ دروستکردنی بەرگری بەرامبەر بە ڤایرۆسەکە بە ڕێژەی لە ٩٠%.






وێنەی ژمارە (٢١): سێ ژەمە کوتانی هەوکردنی جگەر جۆری (B)

پێش وەرگرتنی ماکوتە پێویست ناکات ئەو کەسە خۆی بپشکنێت تا بزانێ دژەتەنی (anti-HBcAg) یان دژەتەنی (anti-HBsAg) هەیە لەناو خوێن واتە پێویست ناکات بزانێ لەشی بەرگری هەیە یان نا بۆ ئەو ڤایرۆسە.

ماکوتەکە کاریگەری خراپی نی یە لەسەر لەش تەنها کەمێك کاردانەوە نەبێت لە کاتی لێدانی ماکوتەکە وەك (تایەکی کەم و سوربونەوەی شوێنی دەرزیەکە لەگەڵ ئازار لەو شوێنە).

بۆ منداڵ لە ٢٤ بۆ ٧٢ کاتژمێری دوای لە دایکبوون دەدرێت بۆ دروستکردنی بەرگری بەرامبەر ڤایرۆسەکە. بە کوتانی منداڵ رێژەی توشبوون کەمدەکەیتەوە بۆ ١%. پێدانی شیر بۆ منداڵێك کە دایکەکە ڤایرۆسەکەی هەیە دروستە بەو مەرجەی کە منداڵەکە لە ماوەی ١٢ کاتژمێری دوای لە دایکبوونی دژەتەنی (Humanimmunoglobulin- IG) وەرگرتبێت لەگەڵ خۆکوتان بە ماکوتەی جۆری ( HB vaccine).

( بەدرێژی باسی دژەتەنی ئامادەکراو دەکەین لە کۆتاییدا )




وێنەی ژمارە (٢٢): کوتانی هەوکردنی جگەر جۆری ( B ) وکوتانی دژەتەن

١) ١٠/٩ ئەو منداڵانەی کە دایکیان هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی هەیە ئەوانیش توشی نەخۆشیەکە دەبن ودەبنە هەڵگری ڤایرۆسەکە، ئەگەر منداڵەکە نەکوترێ لە ٢٤ کاتژمێری یەکەم لە دوای لە دایکبوون.

٢) ٤/١ ئەو منداڵانەی هەڵگری ڤایرۆسەکەن دەمرن بەهۆی کێشەکانی جگەرەوە.

٣) ٢٠/١٩ ئەو منداڵانەی دەکوترێن ئەوا پارێزراون بە درێژایی تەمەن.

**دووەم:** پشکنینی خوێن بۆ ڤایرۆسی **(B)** پێش وەرگرتنی خوێن یان بەکار هێنانی .

**سێیەم:** بەکار هێنانی( کیفك) **( Condom)** لە کاتی کاری سێکسی .

**چوارەم:** دوورکەوتنەوە لە دەرزی لێدانی نا تەندروست یان پیس .

**پێنجەم:** لەکاتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ خوێنێکی توش بوو ئەبێت دەستەوانە بەکار بێت . ئەوانەی برینداردەبن یان شوێنەکیان بەرخوێن دەکەوێت پێویستە ئەو شوێنە بشۆرین لەبەر ئاوی ڕۆیشتوو، دوایی بە ماددەی کحول یان کلۆرهیکسیدین( Chlorhexidine) پاکی بکەنەوە، دوایی برینەکە داپۆشن بە گۆزەکی پاك.

**شەشەم:** بەکار نەهێنانی فلچەو معجونی کەسێکی توش بوو.

**حەوتەم:** دورکەوتنەوە لە تاتۆکردن، دورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی کەرستەی کەسێکی توشبوو وەك(نینۆك بڕ، کەرەسەی ڕیشتاشین ..... هتد)

**هەشتەم:** دوورکەوتنەوە لە پەیوەندی و کرداری فرەسێکسی.

**نۆیەم:** دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنان و وەرگرتنی ماددە هۆشبەرەکان بەتایبەتی بە ڕێگەی دەرزی..

**پێویستە ئەو کەسانە بکوترین:**

١- کەسێك کارو هەڵسوکەوتی سێکسی زۆر دەکات.

٢- دایکێك منداڵێکی تووشهاتوی هەیە و هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکات.

٣- ئەوانەی دەرزی ماددە هۆشبەرەکان بە زۆری بەکاردێنن.

٤- ئەوانەی لە بانکی خوێنن یان کار لەو بوارانە دەکەن.

٥- ستافێك کە بەشدارە لە گۆڕینی ئەندامەکانی لەش (ستافی نەشتەرگەری).

٦- هەموو ئەو کەسانەی لەبواری تەندروستی کاردەکەن (پزیشك، کارمەند.خزمەتگوزار).

٧- ئەوانەی زۆر سەفەر دەکەن.

٨- کەسێك کار دەکات لە سەرتاشخانە و ئارایشگا.

٩- بەرکەوتەی ڕاستەوخۆی کەسێکی توشبوو( Close contacts)

١٠- ئەوانەی نەخۆشی خوێنیان هەیەو خوێن بەبەردەوامی وەردەگرن.

١١- ئەوانەی نەخۆشی پەککەوتنی گورچیلەیان هەیەو سەردانی بەشەکانی گورچیلەی دەستکرد دەکەن.

**چۆنیەتی خۆپاراستن پاش ئەوەی دەرزیەکی پیس بوو بەم ڤایرۆسەت بەرکەوت:**

سێ خاڵ گرنگە بۆیە پێویستە ئەنجامی بدەین پێش وەرگرتنی هیچ چارەسەرێك.

١- سەرچاوەی خوێنە بەرکەوتەکە دیاری بکرێت.

٢- ڕێژەی ئەنتیجینی (HBsAg) ناو خوێنەکە دیاری بکرێت.

٣- باری کوتانی کەسە بەرکەوتووەکە دیاری بکرێت.

- گەر سەرچاوەی خوێنەکە پیس بوو وە ئەنتیجینی تیابوو بەڵام کەسە بەرکەوتەکە نەکوترابوو ئەوا یەکسەر لە ماوەی ٢٤ کاتژمێر دەست دەکەین بە پێدانی دژەتەنی ئامادەکراو ( Anti- HBs ) بە بڕی (٠.٠٦ مل) لە دژە تەنەکە بۆ هەر کیلۆگرامێك لە کێشی لەشی یان (٥) مل بۆ گەورەکان، لە هەمان کاتیشدا دەست دەکەین بە بەرنامەی کوتان کە (٣) ژەمە.
- گەر کەسە بەرکەوتەکە هەستیاری هەبوو بۆ کوتان ئەوا ژەمێکی تری دژەتەنی ئامادەکراوی (I.G)پێدەدرێت پاش یەك مانگ.

- گـەر سەرچـاوەی خوێنەکـە نـەزانرابوو، یـان ڕێـژەی ئـەنتیجینی (HBsAg) وا گومان دەکرا کەم بێت ئەوا تەنها کوتـانی بـۆ دەکرێـت بەڵام دژەتەنی ئامادەکراوی پێنادرێت.
- گەر کەسە بەرکەوتەکە کوترابوو وە ڕێژەی دژەتەنی (anti-HBs) ١٠ ملیۆن یەکە/مل بوو یان بەرزتر ئەوا هیچ خۆپاراستنێکی پێویست نیە.
- گـەر بـاری کوتـانی نـەزانرابوو ئـەوا دژەتـەن و (٣) ژەم ماکوتـەی پێدەدرێت .

**چۆنیەتی خۆپاراستن پاش ئە نجامدانی کاری سێکسی لەگەڵ کەسێکی توشبوو بەم ڤایرۆسە:**

یەك ژەم لە دژەتەنی ئامادەکراو لە ماوەی ١٤ ڕۆژ دوای کۆتا کاری سێکسی و دەستکردن بە وەرگرتنی ماکوتە هەر سێ ژەمەکە.

**چارەسەری نەخۆشیەکە:**

**یەکەم:** ئینترفیرۆن (Peg Interferon Alfa 2a, Peg Interferon Alfa 2b)

**دووەم:** حەبی لامیڤیدین (Lamividin).

١- بۆ قۆناغی توند هیچ چارەسەرێك پێویست نیە، تـەنها چـاودێری نـەخۆش تاوەکو توشی پەککەوتنی توندی جگەر نەبێت. ئەگـەر زانـرا خەریکـە توشـی پەککەوتنی جگەر دەبێت ئەوا دەبێـت بـیر بکرێتـەوە لـە گۆڕینی جگـەر یـان دەست کردن بە پێدانی دەرمانی حەبی لامیڤیدین (Lamividin).

٢- بۆ قۆناغی درێژخایەن: ئەوانەی نیشانەیان کەمە زۆربەیان چارەسەریان ناوێت تەنها بەدواچوون وچاودێری کردنی دەوێت. ئەویش بە پشکنینی خوێن بۆ زانینی ژمارەی ڤایرۆسەکان(PCR) و پشکنینی ئەنزیمەکانی جگەر (Liver function test) و سۆنەری جگەر یان وەرگرتنی پارچەیەك لە جگەر بۆ زانینی باری خانەکانی جگەر (Liver biopsy). ئەگەر ژمارەی ڤایرۆسەکان زۆر بوون و ئەنزیمەکانی جگەر ئاستیان بەرز بوو، وە ئەنیجینی Hepatitis B e-antigen (HBeAg) ئاستی بەرزبوو ئەوا پێویستی بە چارەسەر هەیە کە ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم: ئینترفیرۆن (Interferon)**

**ئینترفیرۆن (Peg Interferon Alfa 2a, Peg Interferon Alfa 2b)**

**١- جۆری (Intron A)Interferon Alpha**

لە ساڵی ١٩٩١ ڕێگەی پێدراوەو بەکاردێت و هاتووتە بازارەوە، بۆ هەردوو تەمەنی منداڵ وگەورە هەیە.

٢- **جۆری (Pegasys) Pegylated Interferon** لە ساڵی ٢٠٠٥ لە بازارەکان بەکارهاتووە تەنها بۆ گەورە هەیە (سەروی تەمەنی ٣ ساڵی). لە ڕێگەی دەرزی لێدانی ژێر پێستە دەدرێت بەم کەسانەی خوارەوە:

- ئەوانەی ڕێژەی ئینزیمی (ترانس ئەمیلایز) یان بەرزە.
- لەکاتی وەرگرتنی پارچەیەك لە جگەر دەرکەوت هەوکردنەکە توندە.

- ئەوانەی نەخۆشی ئایدزیان نیە لەگەڵ هەوکردنی ڤایرۆسی جگەر.
- ئەوانـەی لـەکاتی لەدایکبووندا تـوش نـەبوون واتـە (لـە دایکـەوە بـۆ کۆرپەلە) نەگوازراوەتەوە.

ئەم دەرزیە وا دەکات دابەشبوونی ڤایرۆسـەکە ڕابگرێـت بـە ڕێـژەی ٢٥-٤٠% و پاش (٦) مانگ دەبینین ڕێـژەی ئـەنزیمی (ئەمینۆترانسـفیرەیس) لـە خوێن بەرزبۆتەوەو ئەنتیجینی (HBsAg) لە خوێنی نەخۆشەکە کەم بۆتەوە.

ئەگەر پێش چارەسەرکردن ئەم خاڵانەی خوارەوە لە نەخۆشەکە هەبوون ئەوا کاریگەری ئەو دەرمانە کەمترە دەبێتەوە:

- گەر ئاستی HBV DNA بەرز بوو لە ناو خوێنی نەخۆشەکە پێش چارەسەر.
- گەر نەخۆشەکە نێرینە بوو.
- گەر نەخۆشەکە تووشی بە شەمیٚ بوونی جگەر بوو.
- گەر نەخۆشەکە لە دانیشتووی وولاتانی ئاسیای ڕۆژهەلات بوو، دەرمانەکە کاریگەری کەمترە لە خەلکانی ولاتانی تر..

**بەکارهێنانی دەرزی ئینترفیرۆن بەتەنها ( پیگ ئینترفیرۆن ) یان ( 2a، 2b )**

**(PegIntron) Peg interferon alfa-2b , Peg interferon alfa-2a**

هەردووکیان هەمان کاریگەریان هەیە تەنها ئەوەنـدە نـەبێت، ڕێـژەی گەڕانـەوەی نەخۆشـیەکە لـەکاتی بـەکارهێنانی Peg interferon alfa-2b کەمترە. ئەمانـەش بـە بـڕی ١.٥ مـایکرۆگرام/ کیلـۆگرام دەدرێـت بـە شـێوەی دەرزی لە ژێر پێستە هەفتەی یەکجار.

**پێش بەکارهێنانی ئاگاداری ئەمانەی خوارە بە:**

١- ئەگەر نەخۆشەکە پێشتر هەر نەخۆشیەکی دەرونی هەبوو: کاردەکاتە سەر دەرونی نەخۆش و توشی خەمۆکی گۆرانی هەست و بیرو ئەندێشە دەکات کاتی بەکارهێنانی و تاوەکو ٦ مانگ دوای وەستانی دەرمانەکەش.

٢- ئەوانەی هەستیاریان هەیە بۆ ئەو جۆرە دەرمانانە(Hypersensitivity).

٣- ئەوانەی نەخۆشی تری جگەریان هەیە.

٤- ئەگەر نەخۆشەکە ئافرەت بوو ویستی ببێتە دووگیان یان دووگیان بوو یان شیری دا منداڵەکەی، ئەوا پزیشکی تایبەت ئاگادار بکەوە.

٥- ئەگەر هەر دەرمانێکی پزیشکی وەردەگرت یان دەرمانی گیانی یان خواردنی تایبەت و ڤیتامینات .

٦- هەستیاری بۆ هەر خواردنێك و دەرمانێك و شتی تر..

٧- نەخۆشیەکانی جگەرو گورچیلە.

٨- نەخۆشی چاوو دڵ و ڕژێنەی دەرەقی و نەخۆشی گورگە سوورە.

٩- لەگەڵ دەرمانی Telbivudine چونکە دەبێتە هۆی سڕبوون و مێروله کردن و سووتانەوەی دەست و پەلەکان.

**چۆن ئەو دەرمانە بەکار دێت:**

١- لە ژێر چاودێری پزیشك دەبێت بەکار بهێنرێ و لە ناو نورینگەی تایبەت یان نەخۆشخانەکان.

٢- لە ماڵەوە نابێت بەکاربهێنرێ تەنها بە ئامادەبوونی پەرستیاری شارەزای ماڵان.

٣- هەفتەی یەکجارەو لەهەمان ڕۆژو هـەمان کـاتی خـۆی دووبـارەی بکـەوە هەموو هەفتەیەك .

٤- تەنها لە ژێر قولایی پێستە بدرێت و نەگاتە ناو ماسولکە.

٥- پێش لێدان جوان تێکەڵاوی بکە بەڵام ڕای مەشلەقێنە.

٦- هەر دەرزیەکی ڕەنگی گۆڕابوو یان مەیی بوو یان شـێلوبوو یـان شـکابوو بەکاری مەهێنە.

٧- شوێنی دەرزیەکان بگۆرە.

٨- ئەو شوێنانەی لەش گەر سووربەنەوەو خوران و قلێشی هەبوو دەرزیەکـە لەو شوێنانە بەکار مەهێنە.

٩- ئاوێکی زۆر بخۆوە کاتی وەرگرتنی دەرزیەکە.

١٠- لەوانەیە هەندێ نیشانەی تاو سەر ئێشەو ئازاری لەش دروست بێـت لـەو کات سەردانی پزیشکی تایبەت بکە بۆ وەرگرتنی حەبی پاراسیتۆل و پرۆفین.

١١- سرنجی بەکارهاتوو بـەکار مەهێنـەوە، دەرزی و سـرنجەکە دووربێـت لـە بەردەستی منداڵ .

١٢- کاتەکانی دەرزی لێـدان لـەیاد مەکـە، گـەر لـەبیرت چـوو پەیوەنـدی بـە پزیشکەوە بکە.

١٣- لە بڕی دیاریکراو زیاتر بەکار مەهێنە.

**خاڵی گرنگ دوای بەکارهێنانی دەرزیەکە:**

١- لەوانەیە توشی سەرسووڕان بیت بۆیە سیارە لێمەخوڕە مەکینەو ئامێری تر بەکار مەهێنە.

٢- چونکە دەرزیەکە بەرگری لەش کەم کاتەوە بۆیە کەسی وەرگر، دەبێت دوورکەوێتەوە لە کەسانی تر کە نەخۆشن.

٣- چونکە ئەو دەرزیە خەپلەکانی خوێن کەم دەکاتەوەو خوێن بەربوون زیاد دەبێت، بۆیە دوورکەوە لەهەر چالاکیەکی کەوا لەوانەیە بێتە هۆی بریندار بوون.

٤- گەر نەخۆشەکە نەخۆشی تری جگەری هەبوو پێویستە زۆر وریا بێت نەبێتە ماکی خراپ و پەککەوتنی جگەر.

٥- ئەوانەی شەکرەیان هەیە بە وردی پشکنینی ڕێژەی شەکرە بکەن چونکە شەکر زیاد دەکات دوای دەرزیەکە.

٦- تا ماوەی (٦) مانگ دوای وەستانی دەرزیەکەش باری دەروونی خەمۆکی لەوانەیە توشبێت بۆیە ئاگاداری پزیشك بکەوە کاتی زیادبوونی نیشانەکان.

**بڕی انترفیرۆن و کێش**

| ٨٥ کگم بەسەرەوە | ٧٦-٨٥کگم | ٦٥-٧٥ کگم | ٤٠-٦٠ کگم | کەمتر لە ٤٠ کیلۆگرام کێش | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٨٠ | ١٢٠ | ١٠٠ | ٨٠ | ٥٠ مایکرۆ گرام | Peg-Intron |
| ١٨٠ | ١٨٠ | ١٨٠ | ١٨٠ | ١٨٠ مایکرۆ گرام | Pegasys |

**ماکە خراپەکانی** : تا و ئازاری لەش بەگشتی، خەمۆکی، کەمکردنەوەی هەندێ لە خرۆکە سپیەکان(Neutropenia)، کەمکردنەوەی خەپلەکانی خوێن(Thrombocytopenia)، شێوانی هۆرمۆنەکانی ڕژێنەی دەرەقی.

**دووەم: ئیپیڤار** : Epivir or Zeffix or Heptodin (**لامیڤادین**– lamivudine)

ئەو دەرمانە بۆ دوو جۆر نەخۆشی ڤایرۆسی بەکاردێت: بۆ ئەوانەی توشی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (B) و ئەوانەی توشی ئایدز بوونە، بەڵام بەکار نایەت بۆ ئەوانەی توشی هەردوو نەخۆشی بوونە لە یەك کاتدا.

لە ساڵی ١٩٩٨ لە بازارەکان هەیەو بۆ منداڵ و گەورە.

**ماکە خراپەکانی:**

- پاش وەستاندنی دەرمانەکە لەوانەیە نەخۆشیەکە سەرهەڵداتەوە.
- گەر بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەکار بێت لەوانەیە ڤایرۆسەکان بەرگری بۆ ئەو دەرمانە دروست دەکەن و کاریگەری نامینێ، لەو کات حەبی (Adefovir) بەکاردەهێنرێ لە جیاتی ئەو.
- نابێت ئەو دەرمانە بدرێت لەگەڵ ئەو دەرمانە دژە ڤایرۆسانەی خوارەوە کە بەکار دێن بۆ چارەسەری نەخۆشی ئایدز و لە پێکهاتەکەیان ماددەی (لامیڤادین– lamivudine ):

1- Atripla (efavirenz, emtricitabine, and tenofovir);

2- Combivir (lamivudine and zidovudine);

3- Complera (rilpivirine, emtricitabine, and tenofovir);

4- Emtriva (emtricitabine);

5- Epzicom (abacavir and lamivudine);

6- Trizivir (abacavir, lamivudine, and zidovudine); and

7- Truvada (emtricitabine and tenofovir)

- نابێت ئەو دەرمانە بدرێت لەگەڵ ئەو دەرمانە دژە ڤایرۆسانەی خوارەوە کە بەکار دێن بۆ چارەسەری جۆری (B) و لە پێهاتەکەیان ماددەی (لامیڤادین– lamivudine ):

1- Combivir (lamivudine and zidovudine)

2- Epivir (lamivudine) for treating HIV

3- Epzicom (abacavir and lamivudine); and

4-Trizivir (abacavir, lamivudine, and zidovudine)

- ئەوانەی هەستیاریان هەیە بۆ ئەو دەرمانانەی خوارەوە ئەوا نابێت بەهیچ شیوەیەك ئەو دەرمانە وەربگرن. ( Trizivir (abacavir, lamivudine, and zidovudine)

- پێش وەرگرتنی ئەو دەرمانە پێویستە ئاگاداری پزیشکی تایبەتی خۆت بکەیتەوەئەگەر:

١- نەخۆشی جگەری هەبوو.

٢- نەخۆشی گورچیلەی هەبوو.

٣- هەوکردنی پەنکریاسی هەبوو.

٤- هەندێ جار لەگەڵ وەرگرتنی ئەو دەرمانە ماددەی (ترشی لاکتیك - lactic acid) بەرزدەبێتە کە ترسناکە بەڵام زۆر بەکەمی ڕوودەدات، بۆیە ئەوانەی قەلەون یان نەخۆشی جگەریان هەیە یان ئەوانەی دەرمانی هەردوو نەخۆشی ئایدزو هەوکردنی جگەر وەردەگرن لەیەك کاتدا، وە هەروەها لە هەندێك ئافرەتیشدا لەوانەیە ئەو ماکە خراپە دروست بێت و دەبێت ئاگاداری بن.

گەر ئەو نیشانانە دەرکەوت بە خێرایی پەیوەندی بە پزیشکی تایبەت بکە.

- هەستکردن بە ماندووبوون و بێ هێزی
- ئازاری ماسولکەی چاوەڕوان نەکراو.
- قورسی هەناسەدان.
- ئازاری گەدەو هەستکردن بەوەی کە نەساغە.
- هەستکردن بە سەرما بە تایبەتی ساردبوونی دەست و قاچ.
- سەر قورسبوون و گێژی.
- زیادبوونی لێدانی دڵ و ناڕێکی.

٥- بە شێوەیەکی زانستی لێکۆڵینەوە نەکراوە لەسەر ئافرەتی دووگیان و ئافرەتی شیردەر بەڵام واچاکە نەدرێت لە هەردوو باردا.

٦- ئەوانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە ئەوانیش دەبێت ئاگادار بن کەوا ئەو حەبە خۆشی برێك شەکری تیایە.

پێدانی حەبی لامیڤیدین (Lamividin) بە بڕی ١٠٠ میلگرام ، ڕۆژێ یەکجار بۆ ماوەی (٤٨) هەفتە لەگەڵ ئینترفیرۆن وا دەکات ئاستی HBV DNA دابەزینێ بە ڕێژەی ٩٣-١٠٠% ، هەروەها (HBeAg) کەم دەکاتەوەو دژەتەنەکەی anti-HBe زیاد دەکات و شانەکانی جگەریش ڕێکدەخاتەوە.

بە وەرگرتنی هەردوو جۆر چارەسەر واتە (دەرزی و حەب) چارەسەرەکە باشترە بەڵام تاوەکو ئێستا نەتوانراوە ئەنتیجینی (HBsAg) لە ناو خوێن پاك بکرێتەوە.

ئەو دەرمانانە لە ئەمەریکا بەکاردێت ونرخەکەشی بەرزەو وولاتانی هەژار سوود لەو چارەسەریە وەرناگرن.

### دەرمانەکانی تری بەکارهاتوو لە ئەمەریکا

**تینۆفۆڤار (Viread)Tenofovir :**

ڕۆژێ یەکجار بەکار دێت، لە ساڵی ٢٠٠٨ هاتووتە بازارەوە بۆ گەورە بەکاردێت، بە شێوەی حەب، لەگەڵ ژەمی خواردن بەکاردێت، ئەو ماکە خراپانەشی هەیە:

- سکچوون وهەست بە بێ هێزی و ماکی پێستە و سەرسوورە.
- بە دەگمەنیش پشێوی دەخاتە کاری گورچیلە.

**ئەنتیکاڤیر (Baraclude) Entecavir**

ڕۆژێ یەکجار بەکار دێت، لەساڵی ٢٠٠٥ هاتووتە بازارەوە بۆ گەورە بەکاردێت، بە شێوەی حەب، لەگەڵ ژەمی خواردن بەکاردێت، هەروەها بۆ منداڵان لەو دواییەدا شەربەتی بۆ دروستکراوە، ئەو ماکە خراپانەشی هەیە:

- هەست بە بێ هێزی و سەرسووڕەو خەوزڕانی شەوان.

**ئەدیفۆڤیر: Adefovir Dipivoxil (Hepsera)**

ڕۆژێ یەکجار بەکار دێت بۆ ماوەی یەك ساڵ یان زیاتر، لە ساڵی ٢٠٠٢ هاتووتە بازارەوە بۆ گەورە بەکاردێت، بە شێوەی حەب، لەگەڵ ژەمی خواردن بەکاردێت، هەروەها بۆ منداڵان خەریکە دروستی بکەن.

**ریباڤارین:** هەروەها حەبی **ریباڤارین** Ribavirin دەتوانرێ بەکاربهێنرێ بۆ ماوەی ٦- ١٢ مانگ. ئەو حەبەش نادرێت بە ئافرەتی دووگیان و بەباوکیش چونکە دەبێت هۆکار بۆ نەخۆشی بۆماوەیی – زکماکی لە منداڵەکە.

**دەرەنجامی نەخۆشیەکە:**

١- ڕێژەی ٨٠- ٩٠% پاش ٦-٩ مانگ چاکدەبنەوە.

٢- ١٠% دەچێتە قۆناغی درێژخایەن تاوەکو مردن دەبێتە هەلگری ڤایرۆسەکەو خەلکان توشدەکات.

٣- ڕێژەی ٩٥% ئەو منداڵانەی لە دایکەوە توشیان دەبێت دەچنە قۆناغی درێژخایەن و چاکبوونەوەیان دەگمەنە.

٤- ئەوانەی توشی قۆناغی درێژخایەن بوونە هەندێکیان هیچ نیشانەیان نیە و ئەوانی تر ڕێژەی ١٥-٢٠% توشی بە شەمێ بوونی جگەر دێت پاش ٥-٢٠ ساڵ. بەڵام بە شەمێ بوون لە منداڵان زۆر خێراترەو ڕێژەکەی بەرزترە.

**هەوكردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (ب) و ئافرەتی دووگیان:**

زۆربەی لێكۆڵینەوەكان دەریان خستووە كەوا ڤایرۆسی جگەر جۆری (ب) بە ستوونی ناگوازرێتەوە (واتە لە دایكەوە بۆ كۆرپەلە كاتێك لەناو منداڵدانە) بەڵكو دەگوازرێتەوە لە كاتی لە دایكبوون، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ حاڵەتدا وەك: (داپچڕانی وێلاش و هەروەها لە دایكبوونی پێش وەختەی هەڕەشە– Placenta abruption, Threatened preterm labour) ئەگەری توشبوونی كۆرپەلەكە هەیە لەناو منداڵدان پێش لە دایكبوونی.

واچاكە پێش ئەوەی ئافرەت دووگیان بێت سەردانی پزیشكی تایبەت بكات بۆ ئەم نەخۆشیە بۆ ئەوەی بڕیاری بۆ بدات بزانێ تەندروستی چۆنە؟ ئایا ئەگەر دوو گیان بوو ئەوا كاریگەری لەسەر كۆرپەلەكەی دەبێت و كاتی لە دایكبوونی ڕێژەی توشبوونی چەندە؟ بۆ ئەم مەبەستەش پێویستمان بەچەند پشكنینەك دەبێت :

١- پشكنینی (HBeAg)

٢- پشكنینی دژەتەنەكەی (anti-HBe)

٣- پشكنینی ژمارەی ڤایرۆسەكان و قورسایی.PCR

٤- پشكنینی ئەنزیمەكانی جگەر L.F.T

دوای ئەم پشكنیانە بۆمان دەردەكەوێت كەوا پێویستی بە چارەسەرە یان نا؟ گەر پێویستی پێی بوو ئەوا چارەسەر دەكرێت بۆ ماوەی ٦ مانگ تاوەكو یەك ساڵ بە گوێرەی وەڵامدانەوەی لەش بۆ دەرمانی دژە ڤایرۆسەكان.

زانایان دەریان خستووە کاتیَ ڕێژەی (PCR ) لە IU/ ml ۱۰۸ بەرزترە و (HBeAg) پۆزەتیڤە ئەوا ڕێژەی توشبوون کاتی لەدایکبوون بەرزدەبێتەوە بۆ ۷۰-۹۰% و ئەگەر نیگەتیڤ بوو ئەوا ڕێژەی توشبوون دادەبەزیَ بۆ ۱۰-٤۰% ، ئەو هەنگاوانەی دەهاویشتریَ بۆ پاراستنی منداڵەکەش بە پێدانی ماکوتەو سیرەمی ئامادەکراو ئەوا ئەگەری ڕێژەی سەرنەکەوتن زیاترە لە ۱۰%.

ئەگەر پشکنینەکانی باش بوون و پێویستی بە چارەسەر نەبوو ئەوا دەتوانیَ دوو گیان بێت و کاتی دووگیانی سەردانی پزیشك بکات دووجار، لە یەکەم سیَ مانگ و کۆتا سیَ مانگی دووگیانیەکە بۆ دووبارە کردنەوەی ئەم پشکنیانەی سەرەوە. ئەگەر زانرا کەوا پشکنینەکانی ڕێژەیان بەرزەو ئەگەری ئەوەی لێدەکرێت کەوا بە ئاسانی کۆرپەکە تووش دەکات کاتی لە دایکبوون ئەوا بڕیار دەدرێت بۆ وەرگرتنی چارەسەر پێش کرداری لە دایکبوون، هەرچەندە لێکۆلینەوەکان زۆربەیان پەسەند ناکەن دەرمانی دژەڤایرۆسەکان بدرێت بە ئافرەت کاتی دووگیانی، هەرچەندە هەندێك لێکۆڵینەوە دەڵێن حەبی (لامیڤیدین و تیلبیڤادین– Lamivudin ,Telbivudin) لە سیَ مانگی کۆتایی دووگیانی دەتوانریَ بدرێت و سەلامەتەو ژمارەی ڤایرۆسەکان کەم دەکاتەوە. بەڵام بڕیارەکە دەوەستێتە سەر ئەو حالەتەو بڕیاری پزیشك. ئەگەر بڕیاری وەرگرتنی دەرماندرا ئەوا دوای لەدایکبوون پێویستە دایکەکە چاودێری توند بکرێت نەوەك دوای لەدایکبوون و وەستاندنی دەرمانەکان ڤایرۆسەکە بە توندی گەشە بەسەنیَ (Flair up).

وە نابێت بە هیچ شێوەیەك کاتی لەدایکبوون کرداری دەستێوەردان بکرێت بۆ کۆرپەلەکە،وەك: (بەستانی دوو جەمسەری کارەبایی– ئیلیکترۆد،

وەرگرتنی خوێن لە سەری منداڵ بۆ پشکنین– Fetal scalp electrodes, Fetal scalp blood sampling)، چونکە ئەم جۆرە کردارە پزیشکیانە وا دەکات ڕێژەی توشبوون بەرزبکات بە تێکەڵبوونی خوێن دایك ومنداڵەکە یان بەرکەوتنی خوێنی منداڵەکە بە شلەی دایك. وە هەروەها بە وەرگرتنی نموونەی ( Chorionic villus sampling ,Blood contaminated amniotic fluid) ئەگەری زیاتر توشبوون هەیە.

سەبارەت بە نەشتەرگەری قەیسەری بۆ دەرهێنانی منداڵەکە: ئەویش دوو ڕای جیاواز هەیە، هەندێ لە لیکۆڵینەوەکان دەڵێن هیچ کاریگەری نیەو نابێتە هۆی کەمکردنەوەی ڕێژەی توشبوون، وە هەندێکی تر بە پەسەندتری دەزانن لە لەدایکبوونی ئاسایی.

**دوای لەدایکبوونی منداڵەکە:** پێویستە لە ١٢ کاتژمێری یەکەم سیرەمی ئامادەکراو (HBIG) وەربگرێت بە ڕێگەی بۆری خوێن یان ماسولکە بە بری (IU ١٠٠)، و بەمەرجێ لە ٤٨ کاتژمێر تێپەڕ نەکات، وە لە دوای ١٢ کاتژمێر ماکوتەی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (ب) وەربگرێ بەمەرجێ لە ماوەی (٧) ڕۆژ تێپەڕ نەکات. دوایی منداڵ کۆرسی ماکوتەکان تەواو دەکات لە مانگی دووەم و چوارەم و شەشەم(واتە چوار ژەم ماکوتە وەردەگرێ)، وە وا باشترە کەوا ژەمی چوارەم لە پێش تەمەنی (٦) مانگدا کەمتر نەبێت.

پێویستە پشکنین بۆ منداڵ دووبارە بکرێتەوە سێ مانگ دوای ژەمی چوارەم، واتە لە تەمەنی ٩- ١٨ مانگدا (یان تەمەنی ٦- ١٥) مانگ تاوەکو بزانرێ ئایا ئەو چارەسەری بۆ کراوە بە پێدانی ماکوتەو سیرەم کاریگەری هەبووە لەسەر پاراستنی منداڵەکە و تووشنەبوونی بەم نەخۆشیە، وەیان کاریگەری نەبووە؟

١- ئەگەر (HBsAg) نێگەتیڤ بوو، وە ( Anti HBs) پۆزەتیڤ بوو ئەوا کرداری پاراستنەکە کاریگەر بووەو سەرکەوتو بووە.

٢- ئەگەر (HBsAg) پۆزەتیڤ بوو ئەوا منداڵەکە توشبووە وکرداری پاراستنەکە سەرکەوتوو نەبووە.

٣- ئەگەر (HBsAg) نیگەتیڤ بوو، وە ( Anti HBs) نیگەتیڤ بوو، ئەوا نەمنداڵەکە توشبووەو نەپاراستنەکە سەرکەوتوو بووە. لەو کاتەدا دەبێت بزانین ئاستی ( Anti HBs) چەندە، ئەگەر کەمتر بوو لە (١٠٠ m IU/ L) ئەوا دووبارە ماکوتەی پێدەدرێت بە دوو ژەمی یەك لە دوای یەك و یەك مانگ لە نێوانیان واتە لە مانگی ٧ و٨ تەمەنی منداڵەکە. وە لە تەمەنی ٩ مانگی پشکنینەکان دووبارە دەکرێتەوە.

**سەبارەت بە شیر وەرگرتن:** دەرکەوتووە کەوا هیچ زیادبوونێك نیە لە ڕێژەی توشبوونی منداڵەکە بە شیرخواردنی دایکی کاتێ کە دایکی هەڵگری ڤایرۆسی جگەر بووە (کەواتە شیردان هۆکارێك نیە بۆ گواستنەوەی ڤایرۆسەکە) .

**منداڵی پێش وەختە لە دایکبوو یان کێشی کەم ( Pre term ,Low-birth weight infant):**

ئەگەر منداڵەکە لە پێش ٣٢ هەفتە لەدایکبوو (کێشی هەرچەندێك بوو گرنگ نیە)، وە یان منداڵەکە لە کاتی خۆی لەدایکبوو بەڵام کێشی لە ٢٠٠٠ گرام کەمتر بوو، ئەوا بە هەمان شێوە چوار ژەم ماکوتە وەردەگرێ لە ڕۆژی یەکەم و ٢ ، ٤ ، ٦ مانگی تەمەنی، بەڵام لەوانەیە لەم دوو حالەتەدا ماکوتەکەی کاریگەری تەواوی نەبێت، بۆیە :

١- پشكنینی ( Anti HBs) ی بۆ دەكرێت لە مانگی ٧، ئەگەر ئاستی ئەم دژەتەنە لە 10Miu/mL كەمتر بوو، ئەوا ژەمێكی چالاككەرەوەی لە ماكوتەی پێدەدرێت لە مانگی ١٢ی تەمەنی.

٢- دەتوانرێ بە بێ پشكنین ژەمێكی چالاككەرەوەی لە ماكوتەی پێدەدرێت لە مانگی ١٢ی تەمەنی.

وە پێویستە دایكەكەش بە توندی چاودێری بكرێت بۆ ماوەی چەند مانگێك، نەوەك دوای منداڵبوونەكە توندی نەخۆشیەكەی زیاد بكات.

## هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری Hepatitis Virus(C) - (HCV) :C

**مێژووی ئەم نەخۆشیەو دۆزینەوەی:** **Harvey J. Alter** لە ساڵی ۱۹۷۰ دۆزیەوەو لە ساڵی ۱۹۸۹ ناوی لێنرا (C). هەندێکی تر دەڵێن لە ساڵی ۱۹۸۷ زانا **Brenden Arena** ئەم ڤایرۆسەی دۆزیەوەو ناوی لێنرا **Non A Non B** .

ئەم ڤایرۆسە لە جۆری (RNA) قەبارەی ۵۰ نانۆمیتەرە سەر بە خێزانی ( Flaviviridae ) وە لە توخمی (hepacivirus).

ئەم جۆر ڤایرۆسە سێ جۆری سەرەکی لە جینۆ تایپ(Genotype) هەیە ئەمانیش (۱, ۲, ۳).




**وێنەی ژمارە (۲۳) : شێوەی ڤایرۆسی هەوکردنی جگەر جۆری (C)**

لەسەر ژمێریکی نوێدا دەرکەوتووە کەوا زیاتر ١٧٠ ملیۆن کەس ئەم ڤایرۆسەیان هەیە لە جیهاندا واتە ٢.٣% ی ژمارەی دانیشتوانی زەوی.

ڕێژەی توشبوون لە ئەفەریقیا بەرزترینە، دوایی ئاسیا و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، کەمترینی لە ئەمەریکاو ئەورپایە.

بەرزترین ڕێژەی هەوکردنی ئەو جۆرەیان لە میسرە ١٥% ، پاکستان ٤.٨%، چین ٣.٢% .

زیاتر لە ١٥٠ ملیۆن کەس گەیشتووتە قۆناغی درێژخایەن، سالآنە ٣-٤ ملیۆن کەس بە نویٚ توشی ئەم نەخۆشیە دەبن و سالآنەش ٣٥٠٠٠٠ کەس بەم نەخۆشیەوە دەمرن.

<u>ئەو جۆریان ماکوتەی نیە بۆ هەر سێ جۆر جینۆتایپ.</u>

لە لێکۆلینەوەیەکدا دەرکەوتووە کەوا خەوتن لە نەخۆشخانەو چارەسەرو خەرجی ژمارەی ڕۆژەکانی مانەوە لە نەخۆشخانە لە نێوان سالآنی ١٩٩٤-٢٠٠١، بە ڕێژەی ٢٠% زیادی کردووە.

جۆری(C) لە عیراقدا ڕێژەی گشتی ٠.٤%، بەرزترین ڕێژە لەشاری بابلە کە ١.٤% وکەمترینی لە شاری دهۆکە کە ٠%.




**وێنەی ژمارە (٢٤): ڕێژەی هەوکردنی جگەر جۆری (C) لە عیراقدا**

**ماوەی کرکـەوتنی:** ٢ هەفتـە تـاوەکو (٦) مـانگ بـەڵام زۆربـەی لـە نێـوان ٦-٩ هەفتەدایە.

**ڕێگاکانی گواستنەوە: هەروەك گواستنەوەی جۆری (B) وایە:** کە بە کـورتی ئـەم ڕێگایانـەی خوارەوەن:

١– ڕێگەی خوێنی پیسبوو، وشلەکانی تری لەش.

٢– دەرزی پیسبوو لە کاتی وەرگرتنی مادده هۆشبەرەکان.

٣– بە کاری فرە سێکسی.

٤– لە دایکەوە بۆ منداڵ بە ڕێژەی کەمە کە دەگاتـە ٦% ، بۆیـە ڕێگری لـە سکپڕی ناکرێت. گواسـتنەوەی لـە دایکـەوە بـۆ کۆرپەکـەی لەوانەیـە لـەکاتی

دووگیانیدا بێت یان کاتی لە دایکبووندا بێت. هیچ جیاوازیەکیش نیە لە نێوان لـە دایکبـوونی ئاسـایی ونەشـتەرگەری بـۆ گواسـتنەوەی ئـەو ڤایرۆسـە بـۆ کۆرپەکە وهەروەها شیرپێدانیش کاریگـەری نیـە بـەڵام نـەدرێت باشـترە گـەر گۆی مەمکی دایکی شیردەر قەڵەشی وبریندابوو.




**وێنەی ژمارە (٢٥): ڕێگەکانی گواستنەوەی جۆری (C)**

**قۆناغی دەرکەوتنی نیشانەکان:**

١- قۆناغی توند ( acute): ٨٠-٩٠% هەوکردنی توند بەبێ نیشانەیە.

ئەگەر نیشانەی دەرکەوت بەم نیشـانانە دەسـت پێـدەکات : ئـارەزو نەکردنی خوادن، هیلاك بوون، زەرد بونی پێست و سپێنەی چاو، سك ئێشـە، خورانی سەراپایی لەش، هەندیك جار سك چوون .

تەنها ٢٠-٣٠% ی ئەم نەخۆشیە لە قۆناغی توندەوە چاکدەبنەوە لە ماوەی (٦) مانگدا و ئەوانی تر دەچنە قۆناغی درێژخایەن.

2- قۆنـاغی درێژخایـەن (chronic): نزیکـەی ٧٠- ٨٠% ی توشـبووەکان دەچنە ئەم قۆناغە. لەوانەیە بۆ ماوەی چەند ساڵێك بە بێ نیشانە بێت. ڕێژەی ٢٠-٣٠% بە خێرایی توشی بەشەمێ بوون دەبن لە ماوەی ١- ٢ ساڵدا، ئەوانی تر بە ڕێژەی ٢٠% لە ماوەی ٢٠ ساڵدا، وەیان بە ڕێژەی ٥٠% لە ماوەی ٣٠ ساڵدا. ڕێژەی ٢-٥% دەبێتە شێر پەنجەی جگەر.

**نیشانەکانی بە شەمێ بوونی جگەر ئەمانەن:**

زەرتك، گۆڕانی ڕەنگی میز بۆ تۆخ لە شێوەی چا، گۆڕانی ڕەنگی پیسایی لەشێوەی ڕوون(کاڵ)، لاوازی و ئاوسانی سك و کۆبوونەوەی ئاو تیایدا، توشبوون بە نەخۆشی مێشك (Hepatic encephalopathy) ئەمەش ڕودەدات بەهۆی کۆبونەوەی ئەمۆنیاو هەندێ مادەی تر لە خوێن کاریگەری لەسەر دەماخ. لەو کاتە پێویستە پارچەیەك لە جگەر وەربگیرێ بۆ تەشخیص( Liver biopsy).

**ڕێگاکانی گواستنەوە:**

هەمان ڕێگاکانی جۆری (ب) یە لەگەڵ چەند جیاوازیەکی کەم:

١- بە ڕێگەی خوێن زیاتر و توندتر دەگوازرێتەوە .

٢- بە ڕێگەی سێکسی کەمتر دەگوازرێتەوە.

٣- لە دایك بۆ کۆرپەلە دەگوازرێتەوە کاتی لە دایکبوون و نەشتەرگەری قەیسەری هیچ کاریگەریەکە نیە لەسەر کەمکردنەوەی ڕێژەی توشبوون و هیچ ماکوتەی نیە بۆ بەرگری کردن لە منداڵەکە.

**دەست نیشانکردن و دۆزینەوەی - تەشخیص کردنی :**

دۆزینەوەی دژەتەنی ( Anti HCV) لەناو خوێن وشلەکانی لەش لە ٣ مانگی یەکەمی نەخۆشیەکە بەهۆی پشکنینی ( EIA- Enzyme

(ImmunoAssay)و(Recombinant Immuno Blot) بەلآم ئەو دوو پشکنینە جیـاوازی ناکـات لـە نێـوان قۆنـاغی تونـدو درێژخایـەن. بـەلآم بـەکاردێن بۆدیاریکردنی پێش وەختەی نەخۆشیەکە و ئەو نەخۆشانەی توشی بە شەمێ بوونی جگەر بوونە.

ئەگـەر تەزمایشـی EIA نیگـەتیف بـوو ئـەوا مانـای ئەوەیـە قۆنـاغی درێژەخایەن بـە دوورە. ئەگـەر ئەزمایشـی EIA پـۆزەتیف بـوو لـە هـەردوو قۆناغی توندو قۆناغی درێژخایەن ئەوا بۆ دڵنیابوون ئەزمایشەکی تر دەکرێـت بەناوی (HCV RNA Assay).

پشـــکنینی ( Recombinant Immuno Blot) وەك پاڵپشـــتەك دەکرێت بۆ پشکنینی EIA، کاتێك EIA پۆزەتیف بوو بەلآم ( HCV RNA Assay) نیگەتیف بوو.

ئەزمایشـی دڵنیـابوون ناکرێـت بـۆ ئەوانـەی نیشـانەکانی هـەوکردنی جگەریان هەیە.

شیکردنەوەی جۆری (Qualitative Assay): یەك ئەزمایشی پۆزەتیف مانـای هەوکردنی چالآك دەگەیەنێ ، نێگەتیف بوونی مانای ئەوەنیە ڤایرۆسـەکە لـە خوێندا نیە بەڵکو بەدواچوونی دەوێت.

شـیکردنەوەی بـڕی (Quantitative Assay): دیـاری کردنـی ڤایرۆسـەکە بەکاردێت بۆ ئەوەی بزانرێ کەوا دەرمانـەکانی چارەسـەر کاریگـەری هـەبووە لەسـەر نەخۆشـیەکە. ئـەمانیش بـریتین لـە PCR, TMA (Transcriptin Mediated Amplication) بەکاردێت بۆ پێوانی ئاستی HCV RNA .

**رێگاکانی خۆ پاراستن :**

١- پشکنینی ڤایرۆسی (C) بۆ خوێن پێش بەکار هێنانی .

٢- بەکار هێنانی( کیفك) ( Condom) لە کاتی کاری سێکسی گوماناوی.

٣- دورکەوتنەوە لە دەرزی لێدانی نا تەندروست یان پیس یان تاتۆکردن .

٤- لەکاتی هەڵسوکەوت کردن لەگەل خوێنێکی توش بوو ئـەبێت دەستـەوانە بەکار بێت .

٥- بەکار نەهێنانی فلچەو معجونی کەسێکی توش بوو .

**چارەسەرکردن:**

ئەو کەسانەیە کە چوونەتە قۆناغی درێژخایەن چارەسـەر وەردەگـرن کە بریتیە لە:

**یەکەم: حەبی ریبافیرین Ribavirin:**

بەکاردێت بۆ ئەوانەی توشیان بە جۆری (C) هاتووە و تەمەنیان لە ١٨ ساڵ گەورەترە.

ئەو دەرمانە بەتەواوی ڤایرۆسەکە لەناو نابات بەڵکو دابەشبوونەکەی کەم دەکاتەوە و ڕایدەگرێت.

ئەوانەی بۆ یەکەم جار ئەو دەرمانەیان وەرگرتووە سوودی هەیە، بەڵام ئەوانەی ئەو دەرمانەیان وەرگرتوو سوودی باشی نەبوو، نەخۆشیەکەیان سەری هەڵدایەوە دوای وەستانی حەبەکە، ئەوا ئەو حەبە بە تەنها چارەسەر نیە و سوودی نیە .

بۆ ئافرەتی دووگیان بەکار نایەت، وە تاوەکو (٦) مانگ دوای وەستانی حەبەکە نابێت دووگیان بێت. چونکە کاریگەری لەسەر کرۆموسۆمەکان دەکات توشی نەخۆشی سکماکی (Teratogenic) دەبێت وەهەروەها گەر هاوسەرەکەی ئەو دەرمانەی وەردەگرت پێویستە ئەو پیاوە

لە خێزانەکەی دوورکەوێتەوە لەکاتی دووگیانی یان گەر بەرنامەیان هەبێت بۆ ئەوەی ئافرەتەکە کەوا دووگیان بێت، وە لە کاتی شیر پێدانیش سەلامەتی نە چەسپێنراوە وا چاکە نەدرێت.

توندترین ماکە خراپەکەکانی بریتیە لە تێکشکانی خرۆکە سوورەکان و (کەم خوینی) بۆیە ئەوانەی نەخۆشی کەم خوێنی و و پەککەوتنی دڵ و نەخۆشی توندی دڵ وسیەکانیان هەیە ناتوانن بەکاری بهێنن.

ریباڤیرین کبسولی هەیە یان حەب، ڕۆژی دووجار دەدرێت و بریتیە لە ٢٠٠ میلگرام و بەم شێوەیە دەدرێت.

| کێشی نەخۆش | سبەینان | ئێواران |
|---|---|---|
| کەمتر لە ٦٥ کگرام | ٢ کبسول | ٢ کبسول |
| ٦٥-٨٥ کگرام | ٢ | ٣ |
| زیاتر لە ٨٥ کگرام | ٣ | ٣ |

ئەم حەبە ڕۆژانە دەدرێت بۆ ماوەی (٦) مانگ. بەڵام ئەوانەی توشی جینۆتایپی ١ بوونە (Genotype 1) دەبێت حەبەکە بۆ ماوەی یەك ساڵ وەربگرێت.

**دووەم: ئینترفیرۆن**

لەگەڵ حەبی ریباڤیرین (**Ribavirin**)، ئەم دوو دەرمانە ڕێژەی ١٠-٢٠% بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ سوود وەردەگرن.

**خشتەی چارەسەرو جۆرەکەی و ماوەکەی**

| | ڕێژەکانی چارەسەر | | |
|---|---|---|---|
| ماوەکەی / هەفتە | انترفیرۆن +ریباڤیرین | انترفیرۆن بە تەنها | |
| ٢٤ | ٣٣% | ٦% | |
| ٤٨ | ٤١% | ١٦% | |
| ٢٤ | ٤٩% | ٥% | سەرهەڵدانەوەی نەخۆشیەکە دوای ٦ مانگ |

لە منداڵان لە تەمەنی (٣) ساڵ بەسەرەوە بڕی ٦٠ مایکرۆگرام /م$^{٢}$/ هەفتە. لەگەڵ ١٥ملگرام/کیلۆگرام/ ڕۆژانە حەبی ریباڤار بە دوو جار دەدرێت لەگەڵ خواردن.

گەر ویسترا ئەم بڕەیە کەم بکرێتەوە بەهەر هۆیەك بێت پێویستە بە دوو قۆناغ بێت یەکەم: لە بڕی ٦٠ مایکرۆگرام /م$^{٢}$/ هەفتە بۆ ٤٠ مایکرۆگرام /م$^{٢}$/هەفتە و لە قۆناغی دووەم بۆ ٢٠ مایکرۆگرام /م$^{٢}$/ هەفتە کەم دەکرێتەوە.

ئەوانەی جینۆتایپی (١) هەبوو بۆ ماوەی ٤٨ هەفتەو ئەوانەی جینۆتایپی (٢،٣) هەبوو بۆ ماوەی ٢٤ هەفتە ئەم دەرمانانە وەردەگرێت.

ئەوانەی جینۆتایپی (٢,٣) هەبوو، وە هەردوو دەرمانی( Peg interferon alfa-2b + Ribavirin) وەرگرتوو لە چوار هەفتەی یەکەم HCV RNA لە ناو خوێنەکەی دەرنەکەوت، وە لە ماوەی ١٢ هەفتەی چارەسەرەکەیدا دووبارە پشکنینی بۆ دەکرێت، ئەگەر دەرەنجامی باش بوو ئەوا چارەسەری بۆ ماوەی ٢٤ هەفتە درێژ ناکرێتەوە.

پرۆتۆکۆلێکی تری چارەسەر هەیە بەتایبەتی بۆ ئەوانەی توشی جینۆتایپی (١) بوونە (Genotype 1)

حەبی (بۆسیپریڤار- Boceprevir- victrelis ) کە تایبەتە بە چارەسەری قۆناغی درێژخایەنی جینۆتایپی (١) ئەوانەی کە بۆ یەکەم جار چارەسەر وەردەگرن یان ئەوانەی چارەسەریان وەرگرتووە بەڵام چاکنەبۆتەوە.

دەبینین رێژەی چاکبونەوە گەر ٣٨٪ بێت لەکاتی بەکارهێنانی هەردوو دەرمان: (ئەلفا انترفیرۆن هەفتەی یەك دەرزی لە ژێر پێستە + حەبی ریبافیرین) بەرز دەبێتەوە لە بۆ ٦٢-٦٦٪ گەر حەبی (بۆسیپریڤار- Boceprevir) بۆ بەرنامەی چارەسەرەکە زیاد بکرێت.

لە دراسەیەکی تر ریژەی چاککبوونەوە لە ٢٣٪ بەرزدەبێتەوە بۆ ٥٩-٦٦٪ کاتی بەکارهێنانی هەر سێ جۆر دەرمانەکە.

وە هەروەها رێژەی گەرانەوەی ڤایرۆسەکە دوای چارەسەر کەم دەبێتەوە لە ٣٢٪ بۆ ١٢٪ کاتی بەکارهێنانی هەر سێ دەرمانەکە.

**پرۆتۆکۆلی نوێی چارەسەری جۆری ( HCV )**

| بابەت | هەڵسەنگاندن بە دەرکەوتنی HCV-RNA لە پشکنین وماوەکەی | | کاریگەری |
|---|---|---|---|
| نەخۆشەکە پێشتر چارەسەری وەرنەگرتبوو | دوای ٨ هەفتە لە چارەسەر | دوای ٢٤ هەفتە لە چارەسەر | |
| | دەر نەکەوت | دەر نەکەوت | **ماوەی چارەسەر ٢٨ هەفتە**<br>١- هەردوو دەرمانی ( Peg<br>+ interferon alfa-2b<br>Ribavirin) بۆ ماوەی ٤ هەفتە<br>٢- هەر سێ دەرمان( Peg<br>+ interferon alfa-2b<br>Victrelis +Ribavirin) بۆ<br>ماوەی ٢٨ هەفتە |
| | دەرکەوت | دەرنەکەوت | **ماوەی چارەسەر ٤٨ هەفتە**<br>١- هەردوو دەرمانی ( Peg<br>+ interferon alfa-2b<br>Ribavirin) بۆ ماوەی ٤ هەفتە.<br>٢- هەر سێ دەرمان ( Peg<br>+ interferon alfa-2b<br>Victrelis +Ribavirin ) بۆ<br>هەفتەی ٣٦.<br>٣- (Peg interferon alfa-2b<br>+ Ribavirin) بۆ هەفتەی ٤٨. |
| **نەخۆشەکە پێشتر چارەسەری وەرگرتووە و سەرنەکەوتووە** | دەر نەکەوت | دەر نەکەوت | **ماوەی چارەسەر ٤٨ هەفتە**<br>١- هەردوو دەرمانی ( Peg<br>+ interferon alfa-2b<br>Ribavirin) بۆ ماوەی ٤ هەفتە. |

|  | دەرکەوت | دەر نەکەوت | ٢- هەر سێ دەرمان( Peg + interferon alfa-2b + Victrelis +Ribavirin ) بۆ هەفتەی ٣٦<br>٣- (Peg interferon alfa-2b + Ribavirin) بۆ هەفتەی ٤٨. |
|---|---|---|---|
| **ئەوانەی توشی بە شەمێ بوون هاتوون، ئەوانەی سوودیان وەرنەگرتووە لە چارەسەر** |  |  | ماوەی چارەسەر ٤٨ هەفتە<br>١- هەردوو دەرمانی ( Peg + interferon alfa-2b + Ribavirin) بۆ ماوەی ٤ هەفتە.<br>٢- هەر سێ دەرمان( Peg + interferon alfa-2b + Victrelis +Ribavirin ) بۆ هەفتەی ٣٦<br>٣- (Peg interferon alfa-2b + Ribavirin) بۆ هەفتەی ٤٨. |

ئەوانەی جینۆتایپی (١) یان هەیە بەڵام چڕی ڤایرۆسەکەیان کەمترە لە (٦٠٠٠٠٠ یەکەی جیهانی / مل (600000 IU/ml) دەتوانن بە هەردوو دەرمان چارەسەر بکرێت بۆ ماوەی ٤ هەفتە و دوایی پشکنینەکە دووبارە دەکرێتەوە بۆ زانینی ڕێژەی چاککبوونەوەی.

چارەسەری تەواو بریتیە لە نەمانی ڤایرۆسەکە لە ناو خوێن لەدوای تەواو بوونی چارەسەکەو (٦) مانگ دوای وەستانی چارەسەر.

**دەرەنجامی نەخۆشیەکە:**

زۆربەی نەخۆشەکان قۆناغی توندی نیەو نزیکەی٧٠- ٨٠% ی توشبووەکان ڕاستەوخۆ دەچنە قۆناغی درێژخایەن (chronic)

ئەم قۆناغە لەوانەیە بۆ ماوەی چەند ساڵێك بە بێ نیشانە بێت.

- بەشەمێ بوونی جگەر بە ڕێژەی ٢٠% لە ماوەی ٢٠ ساڵدا.
- وەیان بە ڕێژەی ٥٠% لە ماوەی ٣٠ ساڵدا.
- ڕێژەی ٢-٥% دەبێتە شێر پەنجەی جگەر.

## هەوكردنی جگەری ڤـایرۆسی جۆری D: Hepatitis Virus( D ) ( HDV )

**مێژووی ئەم نەخۆشـیەو دۆزینـەوەی:** زانـای ئیتـالی Mario Rizzetto , لـە سـاڵی ١٩٧٧ ئەم جۆرە ڤایرۆسەی دۆزیەوە لە خوێنی ئەوانەی گەیشتونەتە قۆناغی درێژخایـەن لـە جـۆری (B) ئـەوا ئـەو ڤایرۆسـەش دەچـێتە لەشـیان و هەوكردنەكە بەهێزتر دەكات و جگەر خێراتر دادەرزێنن.

یەكێكە لە جۆرەكانی ڤایرۆسی هەوكردنی جگەر بە دەلتـە ڤـایرۆس ناسـراوەو قـەبارەی ٣٦ نانۆمیتـەرە تـوخمی (Delta virus ) ڤایرۆسـێكی ناتەواوەو ناتوانێت بەتەنها بچێتە ناو خانەكانی لەش و پشـت دەبەسـتێت بـە جۆری (B) تاوەكو بتوانێ سوڕی ژیانی تەواو بكات و دابـەش بێـت و ژمـارەی زیاد بكات.




**وێنەی ژمارە (٢٧) : شێوەی ڤایرۆسی هەوكردنی جگەر جۆری (D)**

ڕێژەی مردن بەو ڤایرۆسە بەرزە بە ڕادەیەك دەگاتە ٢٠% ونزیکەی ١٥ ملیۆن توشبوی هەیە.

**ماوەی کرکەوتنی** : ٢-٨ هەفتەیە.

ماوەی توشبوون: ڕاستەوخۆ دوای سەرهەڵدانی هەوکردنەکە دەست پێدەکات.

**چۆنیەتی توشبوونی بە دوو شێوەیە :**

١- لەگەڵ ڤایرۆسی جۆری (B) پێکەوە دەچنە ناو لەشی کەسەکەو قۆناغی توند دەست پێدەکات، بەم جۆرەیان دەوترێ (هاوبەشە هەوکردن- Acute Coinfection). ئەو جۆرە هەوکردنە زۆربەی حاڵەتەکان کاتێ جۆری (B) چاکبۆوە ئەویش خۆی چاکدەبێتەوە.

٢- کاتێك یەکێك تووشبووە بە هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (B) لە قۆناغی درێژخایەندا ئەوا ڤایرۆسی جۆری (D) یش ئەو هەلە دەقۆزێتەوەو خۆی دەخزێنێتە ناو لەشی نەخۆشەکەو بەم جۆرە هەوکردنەش دەوترێت (زیادە هەوکردن- Super infection). ئەم جۆرەیان زۆربەی دەچێتە قۆناغی درێژخایەن و بە خێراتر توشی بەشەمێ بوونی جگەر دەبێت. زۆرجار هەروەك ئەوە وایە کە جۆری (B) درێژخایەنەو سەر لە نوێ گەشەی سەندۆتەوەو توند بووە.

ڕێژەی ٢٥-٥٠% سەرهەڵدان هاتنەوەی بە شێوەیەکی توند (تەقینەوەی هەوکردنەکە) بە هۆی ئەو جۆرە هەوکردنەیە.

لە منداڵان نیشانەکانی زۆر توندەو زۆربەی دەچێتە قۆناغی درێژخایەن.

**گواستنەوەی نەخۆشیەکە:**

هەروەك جۆری (B) زۆربەی بە هۆی خوێن و دەرزی پیسبوو وکاری سێکسی نێرینە لەگەڵ نێرینەو لە دایکەوە بۆ منداڵ و ئەوانەی زۆر نزیکی نەخۆشن. هەروەها ئاڵۆزیەکانی وەك جۆری (B) وایە.

کەم کردنەوەی هەوکردنی ڤایرۆسی جۆری (B) دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ڕێژەی بڵاوبوونەوەی جۆری (D) .

**دەست نیشانکردنی - تەشخیص کردنی نەخۆشیەکە:**

دەست نیشانکردنی (Anti HDV) بە هۆی دەزگای (EIA)

لە توشبوونی جۆری یەکەم (هاوبەشە هەوکردن) دەبینین ئاستی ( Anti HDV IgM) نزمە و چەند ڕۆژێك دەمینێ و وون دەبێت لە ماوەی دوو مانگ .

لە هەوکردنی جۆری دووەم (زیادە هەوکردن) دەبینین ئاستی( Anti HDV IgM) بەرزەو پاش ماوەیەك دەگۆڕێ بە(Anti HDV IgG) ئەو نەخۆشانە توشی هەردوو باری درێژخایەنی ڤایرۆسی (B,D) دەبن.

**خۆپاراستن:**

باشترین خۆپاراستن بریتیە لە خۆپاراستن لە جۆری (B) تاوەکو توش نەبێت ئەویش بەهۆی کوتانی ٣ ژەمەکەیە، بەڵام کاتێ توشبووی (B) گەیشتە قۆناغی درێژخایەن ئەوا زۆر گرنگە خۆی لە سەرچاوەکانی ڤایرۆسی (D) دووربگرێت. چونکە وەرگرتنی دژەتەن و کوتانی (B) نابێتە بەربەست لە ڕووی توشبوون بە (D).

<u>ئەم ڤایرۆسەش ماکوتەی نیە .</u>




**وێنەی ژمارە (٢٦)؛ جیاکردنەوەی جۆرەکانی هەوکردنی جگەر لە تاقیگەدا**

واتە سەرەتا پسکنینی (B) بۆ دەکەین، گەر جۆری (B) پۆزەتیڤ بوو ئەوا پشکنینی جۆری (D) بۆ دەکەین نەوەك هەردووکیانی تووشبووبێ. بەڵام گەر (B) نیگەتیڤ بوو ئەوا پشکنینی جۆری (A) بۆ دەکرێت، گەر پۆزەتیڤ بوو ئەوا جۆرەکەیان دەست نیشانکرا کەوا (A) بووە، بەڵام گەر جۆری (A) نیگەتیڤ بوو ئەوا پشکنینی جۆری (C) بۆ دەکەین، ئەویش گەر نیگەتیڤ بوو ئەوا پشکنینی جۆری (E) بۆ دەکەین ، بەم شیوەیە هەموو جۆرەکان لە تاقیگەدا دەدۆزینەوە.

## هەوكردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری Hepatitis Virus(G) (HGV) :G

لە ساڵی ١٩٩٥- ١٩٩٦ دۆزراوەتەوە، جۆری (RNA) لە خێزانی فلاڤی ڤایریدیە، پەیوەندی بە هەوكردنی درێژخایەنەوە هەیە.

ڕێژەی هەڵگری ئەو ڤایرۆسە لەناو كۆمەڵگە لە جیهاندا ٢-٥% وە هەوكردنی جگەر دەكات لە كەسانی پێگەیشتوو بە ڕێژەی ١٥-٣٠%.

هەوكردنی ئەم ڤایرۆسە هاوبەشە بە شێوەیەكی سەرەكی لەگەڵ جۆری ڤایرۆسی (B,C, HIV). هەوكردنی جگەر بەم ڤایرۆسە بەتەنها زۆر بەهێز نیە بۆیە زۆر لە زانایان دەڵێن ئەو ڤایرۆسە ڤایرۆسی تایبەت و ڕاستەقینەی جگەر نیە.

گواستنەوەی وەك ڤایرۆسەكانی ترە، بەتایبەتی ڕێگەی خوێن. ماكوتەی نیە.

## جۆری حەوتەم

### هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری F: (HFV) Hepatitis Virus(F)

له پیسایی هەندێ نەخۆش کەوا پێشتر خوێنیان وەرگرتبوو جۆره ڤایرۆسەکیان دۆزیتەوه کەوا گومان دەکرێت هێرش بکاتە سەر جگەر ناوی لێنرا جۆری (F) یان (Togo virus) بەڵام تاوەکو ئێستا ئەم بیردۆزه نەسەلمێنراوه.

**رێگاکانی نەگواستنەوه**

هەموو هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆرەکانی (B,C,D,G) بەم رێگایانە ناگوازرێنەوه:

تەوقە کردن، ماچ کردن ، لەباوەش گرتن ، جێگای خەوتن، پژمە کردن .

## بەشی سێیەم

## سیرەمی ئامادەکراو ( مصل - HBIG )

**چۆنیەتی بەدەست هێنانی:**

کاتێ یەکێك توشی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی دەبێت و ئەنتیجینی ڕووپۆش ( HBs Ag ) ی ڤایرۆسەکە لەناو لەش دژە تەنی بۆ دروست دەبێت بەناوی ( Anti- HBs Ag ). کاتێ پلازمای ئەو نەخۆشە ئاستی دژەتەنی تیایدا بەرز بێت، ئەو سیرەمە وەردەگیرێت لە پلازمای ئەو نەخۆشەو بە کردارێکی کیمیاوی تایبەت دەکرێت بە گیراوەیەك پێی دەڵێن (**سیرەمی ئامادەکراو**) واتە ڕێژەیەکی زۆری لە(Anti- HBs Ag ) تیایە زیاتر لە ١/١٠٠٠٠٠ بەش.

بەگشتی بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی ئەو کەسانەی ڕاستەوخۆ بەرکەوتووی خوێنی کەسێکی تووشبوی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (B) یە وپێویستە ئەو سیرەمە بدرێت لە ماوەی کەمتر لە ١٤ ڕۆژ دوای بەرکەوتن، لەهەمان کاتدا ماکوتەی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی دەدرێت بە بەرکەوتەکە بەمەش پاراستنی درێژەخایەن لە لەشی ئەو بەرکەوتەیە دروست دەبێت.

(١مل) لەو گیراوەیە بریتیە لە مادەی چالاك بە ڕێژەی ٥٠ ملیگرام وسیرەمی لەش بە ڕێژەی ٥٠ یەکەی جیهانی ( IU). ئەم سیرەمە بۆ لێدان بە ڕێگای خوێن( Intravenous -IV) و بە ڕێگەی ماسولکە( - Intramuscular IM) بە کاردێت .

**جۆرەکانی ئەم سیرەمە:** جۆرەکانی ئەو گیراوەیە زۆرە لەوانە( Bayhep-B, Hepa-GamaB, Hyper Hep-B, Nabi-HB, Nabi-HB Nova Plus)

هەیانە بە ڕێگەی خوێن و هەیانە بە ڕێگەی ماسولکەو هەیانە بە هەردوو جۆر بەکاردێت.

بەڵام ئەوەی ئێستا لە عێراق زۆر بەکاردێت بریتیە لە جۆری (Hepatect cp) کە تەنها بە **ڕێگەی خوێنهێنەر دەدرێت(IV)** کە لە خوارەوە باسی دەکەین.

**شێوەی گیراوەکە :**

١) کەمۆلەی (Vial) ٢ مل بریتیە لە ١٠٠ یەکەی جیهانی (IU) International unit

٢) کەمۆلەی ١٠ مل بریتیە لە ٥٠٠ یەکەی جیهانی.

٣) کەمۆلەی ٤٠ مل بریتیە لە ٢٠٠٠ یەکەی جیهانی.

**بۆ کێ بەکاردێت :**

ئەم سیرەمە بەکاردێت بۆ منداڵ، گەنج ، گەورە کاتێك:

١) کەسێك نەکوترابێت بە ماکوتەی هەوکردنی ڤایرۆسی جگەر جۆری (B).

٢) کەسێك گومانی هەبێت لە وەرگرتنی ماکوتەی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (B) (واتە ٣ ژەمەکەی بە ڕێکی وەرنەگرتبێ).

٣) کەسێك بەرکەوتەی لێدانی دەرزیەکی نا تەندروست یان موسێکی تیژی نەشتەرگەری یان گازلێگرتنی کەسێکی تووشبوو بێت(needlestick,bits,sharps).

٤) کەسێك بەرکەوتەی ڕاستەوخۆی کەسێکی تووشبووی ئەم ڤایرۆسە بێت ونەخۆشی تری سێکسی هەبێت وەك (سوزەنەك و فەرەنگی تامیسکەی دامەن ....)

٥) ئەوانەی نێربازی دەکەن.

٦) کارمەندانی تەندروستی کارمەندانی بەرگری نیشتمانی.

٧) ئەوانەی پەیوەندی نزیکیان هەیە لەگەڵ پەیمانگاکانی چاکسازی وخزمەتگوزاری.

٨) ئەوانەی دەزگای شوشتنی گورچیلە بەکاردێنن.

٩) ئەوانەی خوێن یان بەشەکانی خوێن وەردەگرن.

١٠) ئەوانەی بەردەوام سەفەری دەرەوە دەکەن بۆ ئەو وولاتانەی کەوا ڕێژەی بڵاوبوونەوەی ئەو نەخۆشیەی لە ٢٪ زیاترە.

١١) ستافی نەشتەرگەری ئەگەر ماکوتەکەیان وەرنەگرتبێت .

١٢) کەسێك کە ئەندامێکی لەشی بگۆردرێت تایبەت ئەو کەسانەی نەشتەرگەری گۆرینی جگەر ( Liver transplantation) ئەنجام دەدەن .

١٣) دەدرێت بەو مندالآنەی لە دایك دەبن ودایکەکانیان هەڵگری ڤایرۆسی جگەر جۆری (B) ین.

١٤) ئەوانەی بەرکەوتەی فرە سێکسین لە (٦) مانگی ڕابردوودا.

**ئافرەتی شیردەر و دووگیان (الحامل) :**

لەسەر گیانەوەر تاقیکراوەتەوە کەوا زیانی هەیە، بەلآم لە ئافرەتی دووگیان لە ڕووی زانستیەوە تا ئێستا لێکۆلینەوەی تەواو نەکراوە لەو بوارەوە تاوەکو بزانرێ کاریگەی لاوەکی هەیە لەسەر کۆرپەلە یان نا.بەلآم بە

تەجروبە دەرکەوتووە کەوا زیانی نیە. بە هەمان شێوە لە کاتی شیرپێدان لێکۆلینەوەی تەواو نەکراوە لەو بوارەوە.

**ئامادەكاری پێش بە كارهێنانی سیرەمی هەوكردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (B):**

دڵنیابوون لەو ماكانەی كە بەهۆی لێدانی سیرەمەكە دروست دەبن كە بەهۆی زۆر خێرا ڕۆشتن یان هەستیاری كەسەكە پەیدا دەبێت، هەروەها دەبێت نەخۆشەكە چاودیری باش بكرێت لە دەركەوتنی هەر نیشانەیەك لە كاتی وەرگرتنی دژە تەنەكە وەك :

١) دڵنیابوون لە هەر جۆرە هەستیاریەك ( sensitivity).

٢) چاودێری كردن و دڵنیابوون لە فشاری خوێنی كەسەكە .

٣) پێویستە زۆر ئاگاداری ئەو نەخۆشانە بیت كە یەكێك لەم نەخۆشیانەیان هەیە( نەخۆشی گورچیلە(kidney diseases) ، شەكرەی خوێن( Diabetes )یان ئەو كەسانەی( قەڵەون– Obesity) یان ئەوانەی تەمەنیان لە سەروی ٦٥ سالیەوەیە .

**چۆنیەتی وەرگرتنی دژەتەنی هەوكردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (B):**

١) پێویستە بە شێوەیەكی دروست (بێ كەم وزیاد) نەخۆشەكە سیرەمەكە وەربگرێت ٠،٠٦ مل \ كگم.

٢) چاودێری میز ( Urine) گۆڕانكاریەكانی بكرێت.

٣) چاودێری ڕێژەی (S.Creatinine) بكرێت.

**كاریگەری دژەتەنی هەوكردنی جگەری ڤایرۆسی لەسەر ئەو ماكوتانەی كە لاوازكراون ( live attenuated vaccine):**

نابێت سیرەمی هەوكردنی جگەر جۆری (B) بدرێت بەو منداڵانەی كە كەمتر لە شەش هەفتە یان (٣) مانگ ماكوتەكانی وەك ( measles ,mumps , rubella) وەرگرتووە. وا باشترە كەمتر نەبێت لە ساڵێك دوایی

وەرگرتنی ئەم ماکوتانە  چونکە لە وانەیە ماکوتەکە لە ناو ببات یان لە کاری بخات .

**رێگای پێدانی دژەتەنی هەوکردنی ڤایرۆسی هەوکردنی جگەر جۆری ( B )**

١) دوایی بەرکەوتنی کەسێك بە خوێنی کەسێکی توشبوو: پێویستە سیرەمەکە وەربگیرێت بە مەرجێك نەگاتە ٧٢ سەعات  وا باشترە لە ماوەی ٢٤ کاتژمێر بێت دوای بەرکەوتنەکە، لێدانی  ٨ بۆ ١٠ (IU) کە دەکاتە (٠.٠٦مل)  لە سیرەمەکە بۆ هەر کیلۆگرامێك .

٢) بۆ ئەو  نەخۆشانەی کە چاندنی جگەریان بۆ ئەنجام دەدرێت: پێویستە (2٠,٠٠٠) (IU) یەکەی جیهانی دەکاتە (4٠٠مل)  بە رێگای خوێن پێ دەدرێت  دوای ڕۆنکردنەوە بە ناو لە ماوەی نەشتەر گەریکە هەروەها (٢٠٠٠0)یەکەیی جیهانی  لە هەفتەی یەکەم، دوایی هەر دوو هەفتە جارێك (٢٠٠٠٠) یەکەی جیهانی بۆ ماوەی ٣ مانگ، دوایی هەر مانگێك (٢٠٠٠٠) یەکەی جیهانی وەربگرێت تاوەکو ئاستی دژەتەن دەگاتە (IU/L ٥٠٠).

٣) بۆ ئەو  مندالآنەی کە دایکەکانیان هەلگری  ڤایرۆسی هەوکردنی جگەرن جۆری (B): گەر مندالّەکە ٥ کیلۆ بوو ئەوا ١٥-٢٠ یەکەی جیهانی     دوایی لە دایکبوونەکە لەگەڵ ماکوتەی هەوکردنی ڤایرۆسی  جگەر جۆری (B) بدرێت لە هەمان ڕۆژدا، وا باشە ١٢ کاتژمێر نێوانیان هەبێت. دوای تەواوبوونی هەر سێ ژەمی ماکوتەکە یان دوای (٩)مانگ لە دایکبوونەکە پشکنینی بۆ دەکرێتەوە، گەر رێژەی دژەتەنەکە( anti-HBs) لە ناو خوێنی مندالّەکە بەرز بوو، وە

ئەنیجینی ڤایرۆسەکە(HBsAg) لە ناو خوێن نەبوو ئەوا چی تر ناکوترێت. بەلاّم گەر دژەتەنەکە (anti-HBs ) لەناو خوێنی منداڵەکە نەبوو ئەوا دەکوترێتەوە.

٤) بۆ ئەوانەی بەرکەوتەی سێکسین گەر نەکوترابوون ئەوا پێویستە لەماوەی ١٤ ڕۆژ ئەم سیرەمە وەربگرن بەبڕی (٥ مل) ودوایش خۆیان بکوتن بە ماکوتەی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (B).

٥) ئەوانەی شوشتنی گورچیلەیان هەیە: ٨-١٠ یەکەی جیهانی بۆ هەر یەك کیلۆگرام کێشی لەش بەمەرجێ لە ٥٠٠ یکە تێپەڕ نەکات، هەردوو مانگ دووبارە دەکرێتەوە

**ڕێگای لێدان :**

١) پێویستە لە ژورێك لێبدرێت کە پلەی گەرمی گونجاوی هەبێت.

٢) پێویستە ئەم سیرەمە بە ڕێگایی خوێن و دوای تێکەڵ کردن و ڕۆنکردنەوەی لەگەل ئاو بە ڕێژەی ٠،١ مل \کیلۆگرام \کات بدرێت وە بەرزترین ڕێژە زیاتر نەبێت لە (١مل\کیلۆگرام\کات). بە شێوەی گشتی (٢مل) لە ماوەی (١٥) خولەك دەدرێتە ئەو منداڵانەی کە دایکەکانیان هەڵگری ڤایرۆسی هەوکردنی جگەر جۆری (B) ین.

٣) زیادە پێدان ( Over dose) بەندە لەسەر تەمەنی کەسەکە، خێرا ڕۆشتنی ڕێگایی لێدانەکە، یان بونی نەخۆشی تر لە نەخۆشەکە.

**کاریگەری نەویستراو (Undesirable effects):**

١) بـــوونی نیشـــانەکانی وەك (لـــەرز، سەرئێشـــە، تـــا، ڕشـــانەوە، سـوربوونەوەی دەم وچـاو، ئـازارو سـووربونەوە وخـورانی شـوێنی لێدانەکـە، هێلنجـدان، کۆکـە، ئـازاری ناوەڕاسـتی پشـت، دابـەزینی فشاری خوێن، بێهێزی، هەناسە تەنگی ).

٢) بەرزبونـەوەی ڕێـژەی (S.creatinine) زۆر بەکـەمی و لەکارکـەوتنی گورچیلە.

٣) لە بەساڵاچوانی سەروی ٦٥ ساڵ دەبێتە کـەم خـوێنی شـانەکانی دڵ (cardiac ischemia)، ئەمە بە کەمی ڕوودەدات .

٤) ڕوودانی لە هۆش چوون (شـۆك – الصـدمة – anaphylactic shock) کە زۆر بە کەمی ڕوودەدات، یان تێکچوونی فشاری خوێن .

**لەم حاڵەتانەدا بەکار ناهێنرێ:**

١- زیادە هەستیاری بە هیومانگلوبیولین (HIG).

٢- کەمی ئیمیونوگلوبیولین (IgA).

٣- ڕەقبوونی بۆریەکانی خوێن(Atherosclerosis).

٤- نەخۆشی شەکرە .

٥- نەخۆشیەکانی دڵ وبۆری خوێن .

٦- خەســـــتی خـــــوێنی و زۆری خرۆکـــــە ســـــوورەکان (Thrombocytopenia).

٧- پشێوی لە خوێن گیرسانەوە (Blood clotting).

٨- نەجولانەوە بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر جێگە (Sedentary life)

**جـۆری ( HBIG ) کـە لـە ماسـولکە دەدرێـت:** جـۆرێکی تـری ئـەم سـیرەمە دروستکراوە کە بە ڕێگەی ماسولکە لێدەدرێت (IM) بە بڕی ١ مل کـە ٢٠٠ یەکەی جیهانی دژەتـەنی تیایـە لەگـەڵ ١٠٠ -١٧٠ پرۆتینـی مـرۆڤ و هەنـدێ مـاددەی تـری کیمیـاوی وەك ترشـی ئـەمینۆ ئەسـیتیك و سـۆدیۆم کلۆرایدوسـۆدیۆم هایدرۆکسـاید. ئەمەشـیان هـەمان کاریگـەو کاریگـەری نەویستراوی هەیە کە لە سەرەوە باسمان کردن.

هەر یەك شووشە (ڤیال) ٢٠٠ یان ٥٠٠ یەکەی جیهانی تیایە.

لە تەمەنی گەورە: ٥٠٠ یەکەی جیهانی دەتوانرێ بەکار بهێنرێ

لە تەمەنی ١٠-١٨ ساڵ: ٥٠٠ یەکەی جیهانی بەکاردێت.

تەمەنی ٥-٩ ساڵ: 300 یەکەی جیهانی.

منداڵی تازە لە دایکبوو تاوەکو ٤ ساڵ: ٢٠٠ یەکەی جیهـانی، یـان ٣٠- ١٠٠ یەکەی جیهانی بۆ هەر یەك کیلۆگرام کێشی لەش.

بۆ هەموویان پاش یەك مانگ ژەمەکە دووبارە دەکاتەوە.

ئەگەر نەخۆشەکە نەخۆشی خوێن بەربوونی هەبوو لـەو کـات لـە ژێـر پێستە دەدرێت یان لە ناو خوێن.

شوێنی لێدانی دەرزیەکە: لە گەوران لە ماسولکەی باڵی دەدرێت، بـۆ منداڵان لە ماسـولکەی ڕانـی، یـان لـە دوو شـوێنی جیاجیـا گـەر بڕەکـەی ٥٠٠ یەکەی جیهانی بوو.

بۆ هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (C) جۆرێـك لـە سـیرەم هەیـە کە بەکاردێت بۆ ئەوانـەی بەرکەوتـەی ئـەم ڤایرۆسـەن بـەناوی ( Anti-HCV (hyperimmunoglobulin- HCIg ئەم تایبەتمەندیانەی هەیە:

١- بە ئاسانی دروست دەکرێت و هەرزانە.

٢- تەمەنی مانەوەی لەناو لەش زۆرە، بۆیە وەرگرتنی زۆر دووبارە ناکرێتەوە.

٣- کردارێکی نوێی دامرکاندنەوەی ڤایرۆسەکە کراوە کەوا دەبێتە بنبڕکردنی گواستنەوەی ڤایرۆسەکە.

٤- لە وانەیە بتوانیٚ هاوتایی هەموو جینۆتایپەکان بکاتن.

٥- دەتوانریٚ بۆ بەرکەوتەی ئەو ڤایرۆسە بەکار بێت بە کرداری سێکسی یان شوشتنی گورچیلە یان وەرگرتنی جگەر، وە هەوکردنی درێژخایەن.

٦- دەتوتنریٚ بە تەنها بدرێت یان لەگەڵ دەرمانەکانی تر.

# بەشی چـوارەم

## پلانی نەتەوەیی سەبارەت بە هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی

## (National Plan)

**یەکەم: ئامانجە گشتیەکانمان (General Goal)**

١- دۆزینەوەی زۆربەی حالەتەکان لە هەردوو قۆناغی توندو درێژخایەنەکان.

٢- دانان وداڕشتنی بەرنامەی خۆپارێزی بۆ هەر جۆرێك بەتەنها.

٣- ڕێگەگرتن لە پەتاگەری و بڵاوبوونەوەی بەرفراوان.

**دووەم: ئامانجە تایبەتیەکان (Objectives)**

١- کۆنترۆل کردنی ڕوودانی حالەتی نوێ لە هەردوو قۆناغی توندو درێژخایەنەکان بۆ گشت جۆرەکان و کۆنترۆل کردنی پەتاگەری جۆری (A).

٢- کۆنترۆل کردنی هەردوو جۆری (C , B) لە کاتی گواستنەوەی خوێن و پێکهاتەکانی.

٣- کۆنترۆل کردنی گواستنەوەی لە دایکەوە بۆ منداڵ.

٤- لەو بیانیانەی کە دێنە ناو عێراق یان لەناو عێراقدا کار دەکەن.

٥- کۆنترۆل کردنی گواستنەوەی لە نەخۆشەوە بۆ کارمەندی تەندروستی یان بە پێچەوانەوە.

٦- کۆنترۆل کردنی گواستنەوەی بەهۆی تاتۆکردن وسەرتاشین ومەساج وفلچەی ددان.

٧- کۆنترۆل کردنی گواستنەوەی لە نێوان هەردوو هاوسەر.

٨- کۆنترۆلی گواستنەوەی بە هۆی دەرزی.

٩- کوتانی ئەوانەی کۆمەڵەی مەترسیدارن.

١٠- زیادکردنی هۆشیاری خەڵك سەبارەت بە جۆرەکانی وچۆنیەتی خۆپاراستن لێیان.

**ئەركە جێبەجێ كراوەكان(Achievements)**

١- پشكنینی گشت خوێنەكان پێش وەرگرتن.

٢- پشكنینی گشت بیانیەكانی دێنە ناو هەرێم و ناردنەوەی ئەوانەی پۆزەتیڤە.

٣- كوتانی گشت منداڵەكان دوای لە دایكبوون بە ماكوتەی جۆری (B).

٤- پشكنینی خوێنی گشت ئەو نەخۆشانەی نەشتەرگەری ساردیان بۆ دەكرێت بۆ جۆری (B، C).

٥- بەكارهێنانی سرنجی (یەكبارەكی– disposable syringes )

٦- كوتانی ئەوانەی نزیكن لە نەخۆش، هەروەها ئەوانەی مەترسی توشبوونیان زۆرە.

٧- دابینكردنی دەزگای (ئیلایزا– ELISA) لە نەخۆشخانەو بنكە تەندروستیەكانی حكومی وئەهلیەكان.

٨- پشكنین و كوتانی هەردوو ڕەگەز پێش هاوسەرگیری.

٩- جیاكردنەوەی دەزگای شووشتنی گورچیلە بۆ ئەوانەی هەوكردنی جگەریان هەیە بە جۆری (B، C).

١٠- كردنەوەی نۆرینگەیەكی تایبەت بەو نەخۆشیە لە نەخۆشخانەی ڕزگاری لە شاری هەولێر.

**بەربەستەکان:**

١- گومانی دەستنیشانکردنی نەبوونی دڵنیایی تەواوی ١٠٠%.

٢- بوون و بەردەوامی کیتەکانی پشکنین لە کات وشوێنی خۆیدا.

٣- کەمی خولی ڕاهێنان بەتایبەتی لە دەرەوەی هەرێم.

٤- نەتوانینی بەدواداچوونی نەخۆشەکان بە شێوەیەکی پێویست.

٥- نەتوانینی کۆنترۆڵی تەواوی بەشی شووشتنی گورچیلە و خوێن وەرگرتن بەتایبەتی ئەوانەی بەردەوام خوێنیان پێویستە.

٦- کەمی هۆشیاری تەندروستی سەبارەت بەو نەخۆشیە.

**پێویستیەکان:**

١- خۆڕاهێنان لەسەر چۆنیەتی پیادەکردنی ئەو بەرنامەی کە داڕێژراوە وەك پێناسەی حالەتەکان و تەشخیص کردن و دیاری کردنی خالە لاوازەکان.

٢- چۆنیەتی هەژمار کردنی حالەتە نوێیەکان (Incidence rate).

٣- هوشیارکردنەوەیەکی پێشکەوتوو دەربارەی نەخۆشیەکە.

٤- دیاریکردنی هیلەکانی ڕێنمایی دەولەتی( national evidence based guideline).

٥- پیادەکردنی خۆپاراستن وکۆنترۆڵ کردن بە شێوەیەکی سەردەمیانە بەتایبەتی لە دەزگاکانی شوشتنی گورچیلەو ئەوانەی بەردەوام خوێن وەردەگرن.

٦- پیادەکردنی ڕێگای سەردەمیانە لە:

أ- دەستنیشانکردنی هەموو جۆرەکانی ئەو ڤایرۆسە لە تاقیگەدا.

ب- چارەسەرکردنی هەردوو قۆناغی توندو درێژخایەن.

ت- گرتنەبەری ڕێگەی سەردەمیانە لە خۆپاراستن و بەدواداچووندا.

ث- بەکارهێنانی دەزگاو پێداویستی نویێ بۆ تەشخیص کردن لـە هـەموو کات وشوێنێکدا.

## بەشی پێنجەم

## ڕێگەی خودایی بۆ خۆپاراستن لەو نەخۆشیە ڤایرۆسیانە

جۆری (A,E) پەیوەندی هەیە بە پاشەڕۆ و پاك و خاوێنی دەست و جەستەو کەل و پەلی بەکارهێنان و خاوینی ناو ماڵ و خوادن و ئاوی پاك.

ئاینی ئیسلام لە ژمارەیەکی زۆر لە فەرموودە گرنگی بە پاك و خاوێنی و پاككردنەوەی دەست داوە پێش نان خواردن و دوای هاتنە دەرەوە لە ئاو دەست و دوای هەستان لە خەو، هەروەها گرنگی داوە بە داپۆشینی کەل و پەل و قاپ و مەنجەل و بەرداخ تاوەکو شتی نامۆ نەچێتە ناوی، هەروەها فەرمانی کردووە بەوەی کەوا هەناسەمان نەخەینە ناو ئاوی خواردنەوەو فوی تێنەکەین، ئەمانەو زۆر شتی تر کە گشتیان بۆ ئەوەیە تاوەکو خۆمان بپاریزین لە توشبوون بە نەخۆشی، وە هەمووتان دەزانن کەوا خۆپاراستن باشترە لە چارەسەر چونکە کاتی توشبوونی هەر ئەندامێکی خێزان بە نەخۆشی ئەوا ئەو خێزانە لە ڕووی دەرونیەوە ناهاوسەنگ دەبن و خەمی زۆر دەخۆن بەتایبەتی گەر بزانن کەوا نەخۆشەکەیان چاکبوونەوەی قورسە وەیان درێژەخایەنە.

هەروەها کاتێکی زۆریان دەڕوات بە سەردانی پزیشك و خەوتن لە نەخۆشخانە. ئەمەو جگە لە خەرجکردنی پارەیەکی زۆرو چ لەلایەن خیزانەکە وەیان لەلایەن حکومەتەوە بە هۆی پشکنینی نەخۆشیەکەو دەرمان و خەوتن و خواردن لە نەخۆشخانەو بێجگە لە ئەگەری توشبوونی ئەندامی تری خانەوادەو خەلکی تری ناو کۆمەڵگە. ئەو فەرموودانەی خوارەوە بخوێننەوە:

لە ئەنەسی کوری مالکەوە (ڕەزای خوای لەسەربێ) لە پێغەمبەری خوا (سەڵات و سەلامی لەسەر بێت) دەگێرێتەوە: ((كان رسول الله يدخل الخلاء

فأحمل أنا وغلام نحوي اداوة من ماء وغنزة فيستنجي بالماء)) رواه الخمسة.
**كتاب الطهارة (٩٤/١) التاج الجامع للأصول**

**واته کاتى چونه ئاو دەست پێغەمبەرى خوا ئاوى لەگەڵ خۆيدا دەبرد بۆ خۆ پاككردنەوە.**

**لە سلمان الفارسى(ڕەزاى خواى لەسەربىٚ) لە پێغەمبەرى خوا (سەڵات و سەلامى لەسەر بێت) دەگێرێتەوە:** (بركة الطعام الوضوء قبله والوضوء بعده) **كتاب الطعام والشراب (١١٦/٣) واته بەرەكەتى خواردن ئەوەيە دەست نوێژشووشتن پێش خواردن و پاش خواردن.**

**لە ئەبو هورەيرەوە (ڕەزاى خواى لەسەربىٚ) دەگێڕنەوەكە پێغەمبەرى خوا (سەڵات و سەلامى لەسەر بێت) فەرموويەتى:** ((ومن نام وفي يده غمرة ولم يغسله فأصابه شيء فلا يلومن إلا نفسه)) **واته هەر كەسێك دەشتى نەشۆرد دواى خواردن و شتێكى بەدەستەوە ماوەو توشى بە شتێك هات تەنها لۆمەى خۆى بكات. كتاب الطعام والشراب (١٢٢/٣)**

**لە ئەبى قەتادەوە (ڕەزاى خواى لەسەربىٚ) دەگێرنەوە كە پێغەمبەرى خوا (سەڵات و سەلامى لەسەر بێت) فەرموويەتى :** ((إذا شرب أحدكم فلا يتنفس في الاناء)) **واته گەر يەكێك ئاوى خواردەوە لە قاپێك فوى تيا نەكات.**

**لە جابرەوە (ڕەزاى خواى لەسەربىٚ) دەگێرنەوە كەوا پێغەمبەرى خوا (سەڵات و سەلامى لەسەر بێت) فەرموويەتى :** ((غطو الاناء وأوكوا السقاء فإن في السنة ليلة ينزل فيها وباء لا يمر باناء ليس عليه غطاء أو سقاء ليس عليه وكاء إلا نزل فيه ذلك الوباء)) **واته سەرى قاپ و مەنجەلتان داپۆشن و دەرگاى كوندەى ئاوتان ببەستن چونكە ساڵى جارێك نەخۆشى دێتە خوارەوە و دەچێتە ناو ئەو كەل و پەلانە گەر دانەپۆشرابن.**

هەروەها خواردنی هەنگوین و خورما شیرنی بۆ ئەو نەخۆشانە باشە بۆیە پێغەمبەری خوا (سەلات و سەلامی لەسەر بێت): فەرموویەتی:
((الشفاء في ثلاثة في شرطة محجم أو شربة عسل أو كية بالنار وأنهى أمتي عن الكي)) لە ئیبن و عباسەوە بە روایەتی البخاری . كتاب الطب والرقي (٢٠١/٣)
واتە شیفا لە حجامەو خواردنی هەنگوین و کەوی کردنە بەڵام کەوی بۆ ئومەتی دانەناوە.
هەروەها خواردنەوەی بیرەو عەرەق بۆ نەخۆشیەکان جگەر خراپە چونکە دەبێتە هۆکار بۆ توشبوون بە شەمێ بوونی جگەرو زۆر نەخۆشی تری دل و بۆریەکانی خوێن و شەکرە، کەواتە ئەوانەی نەخۆشی ڤایرۆسیان هەیەو عەرەق دەخۆنەوە زیاتر توشی ماکە خراپەکان دەبن و مردن زوتر بەرۆکیان دەگرێت . لەبەر ئەمانەو زۆر هۆکاری تر کە ئەو پەراوە شوێنی باسکردنی نیە خوای گەورە حەرامی کردووە لە سەر ئوممەتی ئیسلامی .
خوای گەورە فەرموویەتی لە سورەتی البقرة : ﴿ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنْفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآَيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴾البقرة: ٢١٩
وە هەروەها لە سورەتی (المائدة) : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ ﴾ المائدة: ٩١
لە ئیبن عمر (ڕەزای خوای لەسەربێ) دەگێرنەوە کە پێغەمبەری خوا (سەلات و سەلامی لەسەر بێت) فەرموویەتی: ((كل مسكر خمر وكل مسكر حرام،

ومن شرب الخمر في الدنيا فمات وهو مدمنها ولم يتب لم يشربها في الآخرة))
رواه الخمسة ۱٤۲/۳. لەگەڵ بوونی ژمارەیەکی زۆری تر لە فەرموودە لەسەر
پاك و خاوێنی خۆ پاراستن لە نەخۆشیە جیاجیاکان ئەمەش بەلگەیە لەسەر
ئەوەی ئاینی ئیسلام گرنگی زۆری داوە بە خۆپاراستن پێش توشبوون و
چارەسەرکردن.

**بۆ جۆرەکانی تری وەك (B,C,D,G)**

کە هۆکاری گواستنەوەی بریتیە لە خوێنی پیس و کردەی سیکسی
دەرەوەی پرۆسەی هاوسەرگیری ودەرزی ماددە هۆشبەرەکان، کە ئەمان
گشتیان لە ئاینی ئیسلام قەدەغەکراوەو ڕێگەی پێنەدراوە. پێش پەیدابوون
و سەرهەڵدان و دۆزینەوەی ئەو نەخۆشیە ڤایرۆسیە کوشندانە بە ۱٤۳٤ ساڵ
ئاینی ئیسلام ئەمانەی حەرام کردووە و سزای کوشندەی بۆ داناوە چونکە
خوای گەورە ئادەمیزادی دروستکردوەو دەزانی چی بۆ باشە لەسەری واجب
کردووەو چی بۆ خراپە قەدەغەی کردووەو سزای دونیایی و دواڕۆژی بۆ
داناوە.

خوای گەورە فەرموویەتی لە سورەتی الاسراء:

﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَا إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا ﴾ الاسراء: ۳۲ واتە هەر نزیکی
ئەم کارانە مەبن چ جای ئەنجامدانی چونکە لەوانەیە بە نزیکبوونەوەش هەر
توشی زیان و نەخۆشی ببیت.

هەروەها لە سورەتی النساء پێمان دەفەرموێ ئەوانەی بەدوای شەهوەو
ئارەزوی خۆیان کەوتوون بەرەبەرە دوور تر و قولتر بەناو ئارەزوەکانیان
ڕوودەچن و زیاتر لە ڕاستی خاوینی دوور دەکەونە، وەك ئەوەیە بکەونە ناو
زەلکاوی بەد ڕەوشتی ونەخۆشی.

﴿وَاللَّهُ يُرِيدُ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَنْ تَمِيلُوا مَيْلًا عَظِيمًا ﴾ النساء: ٢٧. كەواتە بەد ڕەوشتی و زیناو عەرەق خواردنەوەو داوین پیسی هەموو ئەوانە ئیسلام قەدەغەی کردووە چونکە زیانی دەرونی وجەستەیی بۆ خۆی و خێزان و کۆمەڵگەی تیایە.

ئەی گەنجی خاوەن بیرو هۆش ئەی براو خوشکی بەڕێز بۆ ئارەزوویەکی کاتی و تێر کردنی شەهوەی جینسی، تکایە خۆت تووشی ئەم نەخۆشیانە مەکە، چونکە کاریگەری ئارەزووەکە ماوەی کەمە بەڵام دەردەسەری نەخۆشیەکە زۆر دوورو درێژەو لە ڕووی دەرونی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و جەستەیی، لەوانەشە بکەویتە بەر ئەو ڕێژەیەی کەوا نەخۆشیەکە دەبێتە درێژخایەن و توشبوون بە شەمێ بوونی جگەرو شێرپەنجەی جگەر کە چارەسەریان زۆر ئەستەمە.

# بەشی شەشەم

## پەتازانی

*** ماكوتەی هەوكردنی ڤایرۆسی (B) كاریگەری خراپی هەیە ؟**

لە ٩٠% ماكوتەیەكی سەركەوتووەو سەلامەتە بە پێی توێژینەوەش هیچ كاریگەری خراپی نیە، بە ماوەی ١-٦ مانگ بە رێگایی( intra muscular injection) بەسێ ژەمی ١ میللتر بۆ هەر ژەمێك دەدرێت بۆ دەست كەوتنی دژە تەنی لە ٨٥-٩٠% بە رامبەر بە ڤایرۆسەكە .

*** ئایا ڤایرۆسی جۆری (C) لە رێگایی لە دایك بوون یان لە دایكەوە بۆ منداڵ بە شێوەی ستنونی یان شیردان دەگوازرێتەوە؟**

بەڵێ، كاتێك منداڵەكە راستەوخۆ بەركەوتەی خوینی دایكەكە بێت.

١- مەمكی دایكەكە بریندار بوبێ و شیر بدات بەمنداڵ .

٢- دایكێكی توشبوو منداڵەكەی توش دەكات بە رێژەی تەنها ٦% بەشێوەی ستونی، واتە لە كاتی سكپڕی.

٣- لە كاتی لە دایك بوون ئەگەر راستەوخۆ خوێنی دایكەكە بەر خوێنی كۆرپەلەكە بكەوێت .

*** ئایا ڤایرۆسی هەوكردنی جگەر لە ریگایی مێشولە دەگوازرێتەوە؟**

تا ئێستا هیچ حالەتیك تۆمار نەكراوە كە لەم رێگایە بگوازرێتەوە .

*** ئایا كەسێك هەلگری ڤایرۆسی جۆری (C) بێت دەتوانیت ماكوتەی (B) وەربگریت ؟**

بـەڵێ زۆر دورسـتەو پێویسـتە وەریبگرێـت چـونکە بـونی هـەردوو جـۆری ڤایرۆسەکە لە کەسێك هەوکردنەکە سەخت تر دەکات .

*** ئایا چارەسەری سروشتی هەیە بۆ جۆرەکانی هەوکردنی ڤایرۆسی ؟**

لە بەر ئەوەی ڤایرۆسەکان بە بـەرگێکی پرۆتینـی وچـەوری داپۆشـراوە بۆیـە چەوری ناوەندێکی زۆر باش ئـەبێت بۆ ژیانیـان ، هـەروەها یـەك لـە فەرمانـە گرینگەکانی جگەر شیکردنەوەی چـەوریە، بـە بـوونی ئـەم ڤایرۆسـانە جگـەر توانـایی شـیکردنەوەی چـەوری بـە باشـی نابێـت، بۆیـە پێویسـتە خـواردنی خۆراکە (چەوریەکان )بەرێژەی بـاش (کـەم بکرێـت) وە بـۆ زیـاتر چـالاکردنی ئەنزیمی (ڕەنگی زەرد) کە بـەر پرسـە لـە شـیکردنەوەی مادەکـان خـواردنی شیرینی زیاد بکرێت بەمەرجێك نەخۆشی شەکرەی نەبێت.

*** ئەگەر کەسێك ماکوتەی تەواو نەکرد بێ؟**

ئەگەر کەسێك یـەك ژەمـی وەرگرتبـو و مێـژووی وەرگرتنـی ژەمەمەکـەی بـیر نـەمابوو لـەو حاڵەتـە دەتـوانی ژەمـی یـەك دووبـارە بکاتـەوە وە دەتـوانێ تـەواوکەری ژەمەکان تەواو بکات بـە هـەردوو ڕێگـا هـەر دروسـتە ، بـۆ ژەمـی دووەم و سێهەمیش بە هەمان شێوە دەبێت .

*** ئایا ماکوتەی هەوکردنی ڤایرۆسی جگەر جۆری (B) تا چەند کاریگەرە ؟**

ماکوتەکـە بـە ڕێـژەی ٩٥% پـارێزەرە، و یەکـەم ڕێگـای خۆپارسـتنە بۆیـە گرینگە بەو ماکوتەیە خۆت بکوتیـت و ماکوتەکـە ١٥ تـا ٢٠ سـاڵ کاریگـەری هەیە وە لـە بچوکەکان ئەوانـەی دەفتـەری کوتانیـان هەیـە وە لـە حاڵـەتێك ئەگەر لەگەڵ کەسێك دەژین کە ڤایرۆسەکەی هەیە ئەوا پێویستە لـە تەمـەنی

+۱۲ ساڵیدا دوایی پشکنین کە بۆی دەرکەوت بەرگری وەرگیراوی نەماوە ئەوا دووبارە خۆی دەکوتێت.

*** ئایا جۆرەکانی تری هەوکردنی ڤارۆسی جگەر کوتانیان هەیە ؟**

تەنها جۆری (B) وجۆری (A) ماکوتەی هەیە، بەلام ماکوتەکە لە هەموو کاتێت لێنادرێت تەنها لە کاتی بوونی یان بلاو بونەوەی پەتاکە یان ئەگەر منداڵێك یان کەسێك پەتاکەی گرت ئەوا پێویستە ماکوتەکە بدرێتە کەسە نزیکەکانی وە کاری خۆپارێزیش ئەنجام بدرێت .

*** ئایا جیاوازی هەیە لە رێژەی گواستنەوەی نێوان هەوکردنی ڤایرۆسی جگەر جگەر جۆری (B ، C ) لە رێگای سێکسەوە ؟**

بەڵێ جیاوازی هەیە، جۆری (C) کەمتر دەگوازرێتەوە لە رێگایی سێکسیەوە لە جۆری (B ) بەلآم بە بوونی نەخۆشیە زایندیەکانی تر ئەو رێژانە زیاد دەکەن وەك (ڤایرۆسی داروخانی یان کەموو کوری بەرگری لەش– ئایدز).

# بەشی حەوتەم

## بۆ زیاتر کردنی هۆشیاری تەندروستی

## (دەزگای بەیان بۆ گەشە پێدانی مرۆیی) بە هەماهەنگی لەگەڵ

## (وەزارەتی تەندروستی)

ئەم لیفلیت و پۆستەرانەی کە لە (خوارەوە هاتوون) لەسەر هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی و ئایدز وەك پرۆژەیەکی هۆشیاری تەندروستی چاپ کران لەسەر ئەرکی (دەزگای بەیان بۆ گەشەپێدانی مرۆیی) لە زۆربەی بنکە تەندروستی و زانکۆکان و قوتابخانەکانی ئامادەییەکان ئەو دوو بابەتە وەك محازەرە پێشکەش کران و ئەم لیفلیت و پۆستەرانەش بڵاوکرانەوەو دابەشی سەر بەشداربووان کران، تاوەکو نەوەکانی کۆمەڵگەکەمان ئاگاداری ووردەکاریەکانی ئەم نەخۆشیانە بن و خۆیان لێ بپارێزن.

لفلیتەکان: ١٥٠٠٠ دانەی لێ چاپکرا.

پۆستەرەکان: ٣٠٠٠ دانەی لێ چاپکرا.






دەزگای بەیان بۆ گەشەپێدانی مرۆیی
مؤسسـة البيـان للتنمية البشرية
AL-BAYAN FOUNDATION FOR HUMAN DEVELOPMENT

**پرۆژەیەکی هۆشیاری تەندروستیە بە هەماهەنگی لە نێوان**
**(وەزارەتی تەندروستی) و (دەزگای بەیان بۆ گەشەپێدانی مرۆیی)**



# هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی

0750 468 5606
0750 748 7407
 al.bayanfoundation.2011
al.bayanfoundation@yahoo.com

# هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی

## جگەر چی یە ؟

یەکێکە لە گرنگترین ئەندامەکانی لەش ، کێشی ( 1 - 2 ) کیلۆ گرامەو دەکەوێتە لای ڕاست ژێر ناوپەنچکەوە لە کاتی ئاسایی لە پشکنیندا هەستی پێناکرێت لە ئۆرگانە دەگمەنەکانی لەش دەژمێردرێت و بە بێ جگەر ژیان بەردەوام نابێت زیاتر لە 1000 ئیش دەکات و 101 کاری سەرەکی لە لەشدا ئەنجام دەدات . کارگەی دروستکردنی ماددە کیمیاییەکانی لەشی مرۆڤە و بە گەورە ترین کارگەیە کە مرۆڤ ناسیبێتی گەر بەراوردی بکەی بە قەبارەکەی و توانای خۆ نوژەنکردنەوەی هەیە .

## هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی چی یە ؟

نەخۆشیەکی گوازراوەیە بە هۆی ڤایرۆسەوە تووشی مرۆڤ دەبێت ، پێی دەڵێن ( Hepatitis Virus ) ، زیان بە خانەکانی جگەر دەگەیەنێت ، هەندێک حاڵەتی کاتیە و هەندێکی تریش درێژ خایەنە ئەم نەخۆشیە تایبەتمەند یەکی هەیە ئەویش بوونی خانەکانی هەو کردنە لە ناو ڕیشاڵەکانی جگەر .

## جۆرەکانی

هەوکردنی جگەر چەند جۆرێکی هەیە کە ئەمانەن ( G-E-D-C-B-A )

## زەردوویی ( زەرتک )

بریتیە لە زەرد هەڵگەڕانی پێست و سپێنەی چاو لە دەرەنجامی بەرز بوونەوەی ڕێژەی ماددەی بیلیرۆبین ( Bilirubin ) لە ناو خوێن و یەکێکە لە نیشانەکانی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی بە گشت جۆرەکانیەوە . 85٪ زەردوویی بەهۆی تووش بوونە بەیەکێک لە ڤایرۆسەکانی جگەر و 15 ٪ بەهۆی هۆکاری ترەوەیە .

## هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری ( A )

ناوی زانستی ( Hepatitis A virus ( HAV ) )ە ، نەخۆشیەکی درمیە زوو دەتەنیتەوە ، تووشی مندالأنی تەمەن نێوان 3 – 8 سالأن دەبێت ، ئەگەر جارێك تووشی کەسێك بێت ، ئەوا لەش بە درێژایی تەمەن بەرگری لە بەرامبەری دروست دەکات . سالأنە 1,5 ملیۆن کەس تووشی ئەم نەخۆشیە دەبن .

نیشانەکان :



سک ئێشە



ئارەزو نەکردنی خواردن



زەردوویی



هێلنجدان و رشانەوە



تای بەرز

- ✓ زۆربەی تووش بوان دوای ( 2 – 6 ) هەفتە بە تەواوی چاك دەبنەوە
- ✓ رێژەیەکی کەم لە تووش بووان بەم ڤایرۆسە دەچنە قۆناغی درێژ خایەن

## هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری ( E )

ناوی زانستی ( ( HEV)Hepatitis E Virus )، زیاتر تووشی هەرزەکار و گەورە دەبێت . رێژەی مردن لە نێو ئافرەتانی دوو گیان بەرز دەبێتەوە بە رێژەی 20 ٪ لە کاتی تووش بوونیان بەم جۆرە ڤایرۆسە

## ڕێگاکانی گواستنەوەی ئەم دوو جۆرە نەخۆشیە


پیس بوونی ئاوی خواردنەوە بە ئاوی زێراب


دەستی پیس بوو بە پاشەڕۆی نەخۆش


مێش و مەگەز


سەوزە و میوەی نەشووراوە بە ئاوی پاك


خۆراکە دەریاییەکانی پیس بوو بە پاشەڕۆی مرۆڤ


هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ تووش بوو و گوێنەدان بە خۆپارێزی

## خۆپاراستن لەم نەخۆشیە

جۆری ( A ) ماکوتەی هەیە بەڵام پێویست ناکات هەموو خەڵك بکوترێت تەنها بۆ، کاتی بڵاوبوونەوەی پەتایەکی توند لە ناوچەیەك، یان بۆ ئەو کەسانەی هەندێ نەخۆشی کوشندەیان هەیە. وەیان ئەوانەی سەفەر دەکەن بۆ ئەو ناوچانەی کە ئەو نەخۆشیە زۆربڵاوەو ئەستی پاك وخاوێنیان کەم . بۆ هەندێ حاڵەتی تری تایبەت وە ڕێگەکانی تری خۆپاراستن ئەمانەن:


خواردنەوەی ئاوی پاك لە سەرچاوەیەکی خاوێن


پاشکردنی ڕێڕەوی ئاوەڕۆکان


شووشتنی دەست پێش نان و دوای دەرچوون لە ئاو دەست و دوای هەر کارێك


دوور کەوتنەوە لە خواردنی سەر دانە پۆشراو


جیا کردنەوەی کەل و پەلی تووش بوو بەم نەخۆشیە


پاش شووشتنەوەی سەوزە و میوە ئینجا خواردنی


هەبوونی زانیاری و هۆشیاری دەربارەی ئەم نەخۆشیە






## هەوكردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری(A, E): Hepatitis A & E

بریتی یە لە ئازار و ئاوسانی جگەر لە ئەنجامی چوونە ژوورەوەی جۆرێک لە ڤایرۆسی جگەر (A, E) وبریندار بوون و تێکشکان ولەکارکەوتنی خانەکانی جگەر بۆ ماوەیەک و دەرکەوتنی هەندێ نیشانە:

### نیشانەکان:


سک ئێشە


ئارەزو نەکردنی خواردن


زەردوویی


هێلنجدان و ڕشانەوە


تای بەرز

### ڕێگاکانی خۆ پاراستن:


دڵنیابوون لە سەرچاوەی ئاوی خواردنەوە


سەوزەو میوە باش بشۆ ئینجا بیخۆ


خۆت بە دوور بگرە لە زێراب و پاشماوی مرۆڤ


دەستەکانت جوان بشۆ پێش نان خواردن و دوایی لە ئاودەست دەرچوون


لەفەی سەر عرەبانە مەخۆ دڵنیابە لە سەرچاوەی خواردنی دەرەوە

پرۆژەیەکی هۆشیاری تەندروستیە بە هەماهەنگی لە نێوان (وەزارەتی تەندروستی) و (دەزگای بەیان بۆ گەشەپێدانی مرۆیی)

دەزگای بەیان بۆ گەشەپێدانی مرۆیی
مؤسسة البيان للتنمية البشرية
AL-BAYAN FOUNDATION FOR HUMAN DEVELOPMENT

# جگەرت بپارێزە لە هەوکردنی ڤایرۆسی (بی و سی)

ڕێگاکانی گواستنەوە :

Hepatitis B and C

- تاتو کردن
- بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر بە دەرزی
- کەلوپەلی نەشتەرگەری پیس بوو
- لە دایکەوە بۆ منداڵەکەی
- بوتڵی خوێن کە پیس بوبێ بە ڤایرۆسەکە
- کەلوپەلی ڕیشتاشین
- سێکسی کوماناوی

## لەم ڕێگایانە نا گوازرێتەوە

- نان خواردن بەیەکەوە
- ماچ کردنی منداڵ
- تەوقە کردن
- پژمە و هەناسە

**ماکەکانی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی (B.C)**
**قۆناغی درێژخایەن:**

- بە شەمی بوونی جگەر ( Liver Cirrhosis )
- شێرپەنجەی جگەر (Liver Cancer )
- لە کارکەوتنی جگەر (Liver Failer )

**ماکوتەی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (B) یەکێکە لە گرینگترین ڕێگاکانی خۆپاراستنت لە ڤایرۆسەکە .**

پرۆژەیەکی هۆشیاری تەندروستیە بە هەماهەنگی لە نێوان
(وەزارەتی تەندروستی) و (دەزگای بەیان بۆ گەشەپێدانی مرۆیی)





دەزگای بەیان بۆ گەشەپێدانی مرۆیی
مؤسسـة البيـان للتنمية البشرية
AL-BAYAN FOUNDATION FOR HUMAN DEVELOPMENT

**پرۆژەیەکی هۆشیاری تەندروستیە بە هەماهەنگی لە نێوان**
**(وەزارەتی تەندروستی) و (دەزگای بەیان بۆ گەشەپێدانی مرۆیی)**

# هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (بی)

# ( Hepatitis B virus )


0750 468 5606
0750 748 7407
al.bayanfoundation.2011
al.bayanfoundation@yahoo.com

## هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (بی) Hepatitis B virus :

نەخۆشیەکی ڤایرۆسی گوازراوەی درمە هەموو تەمەن و رەگەز تووشی دەبن کاری ئەم ڤایرۆسە هێرش دەکاتە سەر جگەر و چالاکیەکانی کەم دەکاتەوە و دەبێتە هۆی هەوکردنی توندی جگەر (Acute liver diseases) یان هەوکردنی درێژخایەن (Chronic liver diseases) . نیشانەکانی بریتیە لە: تا ،نارەزوو نەکردنی خواردن،ئازار لە بەشی سەرەوەی سک لای راست ،هێلنجدان ، زەرد بوونی پێست و سپێنەی چاو، گۆرانی رەنگی میز بە رەنگێکی وەک چا ، رەنگاو رەنگ دەرکەوتنی رواڵەتی نەخۆش؛ لە هەندێک بەشەی (مۆم) بوونی جگەر (Liver cirrhosis) یان شێرپەنجەی جگەر (Heoatocellularcarcenoma) هەندێک جاریش دەبێتە هۆی پەککەوتنی جگەر (Liver damage &failoure).

* ساڵانە 1,000,000 کەس بە هۆی ئەم نەخۆشیەوە دەمرن * ساڵانە 4,000,000 سەر لە نوێ تووشدەبن

## هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (سی: Hepatitis C virus

جۆرێکە لە هەوکردنی جگەر بە هۆی ڤایرۆسەوە (Hepatitis C virus) ،ڤایرۆسەکە هێرش دەکاتە سەر جگەر دەبێتە هۆی تێکدانی کارەکانی جگەر ، هەوکردن یان سوتانەوە جگەر ؛ نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە بە دوو قۆناغ دەردەکەوێت

1 ـ قۆناغی تیژ ( acute ):ئەم قۆناغە سەرەتایی دەرکەوتنی نیشانەکانە وە بریتیە لە نارەزو نەکردنی خواردن ، هیلاک بوون، زەرد بوونی پێست و سپێنەی چاو، سک ئێشە ، خورانی سەراپایی لەش هەندێک جار سک چوون

2 ـ قۆناغی درێژخایەن ( chronic ) ئەم قۆناغە لە 10-20 ساڵ نیشانەکانی لەسەر دەر دەکەوێت بە زانینی پشکنینی جگەر ( Liver biopsy ) وە نیشانەکانی ئەم قۆناغە بریتیە لە ( سوتانەوەی جگەر (مۆم بوون) ( liver cirrhosis ) ، کۆبونەوەی شلە لە سک ( Ascites )، گەورەبونی موولولەی خوێن لەگەدە و ناوەحەتی گەدە ( Varices )، زەردوی ،گۆرانی رەنگی میز بۆ شێوەی چا،گۆرانی رەنگی پیسایی لەشێوەی روون(کاڵ) تووشبوون بە نەخۆشی مێشک لە هەستیاری جگەر ( Hepatic encephalopathy )، لاوازیەی.

* 170 ملیۆن کەس لە جیهان هەڵگری ئەم ڤایرۆسەن * ساڵانە 3-5 ملیۆن کەس تووشی ئەم ڤایرۆسە دەبن
* 70-80٪ تووشبووان نیشانەکانی ئەم نەخۆشیەیان لەسەر دەرناکەوێ * 50-80٪ تووشبووان دەچنە قۆناغی درێژخایەن

## هەوکردنی ڤایرۆسی جۆری (D,G) Hepatitis D,G

ئەو دوو جۆرەیان ( D,G ) بە تەنها کەمتر خەڵک تووشی هەوکردنی جگەر دەکەن بەڵکو دەچنە ناو لەشی ئەو کەسانەی کە تووشی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری ( B,C ) بونە لە قۆناغی درێژ خایەن یان ئەو کەسانەی تووشی داروخانی بەرگری لەش هاتوون( ئایدز ) ( AIDS )

رێگایی خۆپاراستن لە هەوکردنی ڤایرۆسی جۆری ( D ) :

باشترین رێگەی خۆپاراستن بۆ ئەو دوو جۆرە ڤایرۆسە ( D,G ) بریتیە لە خۆ پاراستن لە هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری ( B,C ) و نەخۆشی ئایدز

* 10 ملیۆن کەس لە جیهان تووشبوون ،ساڵانە زیاتر لە یەک ملیۆن کەس تووشی ئەم نەخۆشیە دەبن هەروەها ماکوتەیان نیە

## ڕێگاکانی گواستنەوەی ( ب - س )



کرداری سێکسی یان فرە سێکسی بە تایبەت نێوان ژن و پیاوان



گواستنەوەی خوێن لە کاتی نەشتەرگەری یان بۆ ئەوانەی پێویستی بەردەوامیان هەیە بە خوێن



بەکار هێنانی دەرزی پیسبوو یان هەر ئامێرێکی پزیشکی پیسبوو



بەکار هێنانی کەرەستەی ریش تاشین یان تاتو کردن یان فلچەی ددانی توشبوو



دایك بۆ کۆرپەکەی لە کاتی لەدایك بووندا



لە ڕێی کار کردن لە نەشتەرگەری گشتی یان تاقیگە یان شووشتنی گورچیلە یان برین پێچی

## خۆپاراستن لەم نەخۆشیە

1- کوتان بە ( 3 ) ژەم بە ماکوتەی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی لە جۆری (B).
2- دوورکەوتنەوە لە کاری سێکسی لە دەرەوی ژیانی هاوسەری بە هەموو جۆرەکانی .
3- پشکنینی خوێن و دڵنیابوون لە پاکی پێش وەرگرتنی خوێن، هەروەها پێکهاتەکانی .
4- دوورکەوتنەوە لە بەکار هێنانی کەلوپەلی کەسێکی توشبوو وەك موس و فلچە...
5- دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەرزی پیسبوو، وە کەل وپەلی تاتۆکردن وکەلەشاخی نا تەندروست.
6- دڵنیابوون لە پاك وخاوێنی کەلوپەلی نەشتەرگەری ددان و نەشتەرگەری گشتی.

## کێ پێویستە بکوترێت ؟



ئەوانەی کاری سێکسی زۆر لە دەرەوی ژیانی هاوسەری ئەنجام دەدەن



دایکێك منداڵێکی تووشبوی هەیە و راستەوخۆ مامەڵەی لەگەڵ دەکات



ئالوودە بوان بە ماددە هۆشبەرەکان



ئەوانەی لە بانکی خوێن کار دەکەن



ستافی نەشتەرگەری



هەموو کارمەندانی تەندروستی



ئەوانەی زۆر سەفەر دەکەن



ئەوانەی لە سەرتاشخانە و ئارایشگا کاردەکەن



ئەوانەی مامەڵەی راستەخۆ لەگەڵ تووش بوویەك دەکەن

- ساڵانە 1,000,000 بەهۆی ئەم نەخۆشیەوە دەمرن
- ساڵانە 4,000,000 کەسی نوێ تووشی ئەم نەخۆشیە

## بەڕێوەبەرایەتی گشتی تەندروستی هەولێر
## بەڕێوەبەرایەتی کاروباری پاراستنی تەندروستی
### هۆبەی نەخۆشیە زایندیەکان
### *یەکەی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی*
### هەڵسوکەوت لەگەڵ نەخۆشانی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری B , C ونەخۆشی ئەیدز لە ناو ژووری نەشتەرگەری

**دەبێت بە ووردی پابەند بوونی تەواوەتی لە هەموو خاڵە بنەڕەتیەکانی ئەم ڕێنماییانەدا بکرێت.**

- ❖ پێویستە لێپرسـراوی هـۆڵی نەشـتەرگەری ئاگـادار بکرێتـەوە لـە هـەبوونی ئـەو جـۆرە حاڵەتانـە هـەروەها نـاوی نەخۆشـەکە بـە ڕەنگـی سـوور لـە نـاو لیسـتی نەشـتەرگەریەکە بنووسرێت.
- ❖ ئـەو کەلوپەلانـەی لـە گواسـتنەوەی نەخۆشـەکە بـۆ ژووری نەشـتەرگەری بـەکاردێن وەکـو (چەرچـەف و بـەتانی ..هتـد) دەبێـت بخرێنـە نـاو کیسـە نـایلۆنی سـوور و بنێـردێن بـۆ ژووری شـۆرینگە (وحـدة غسـیل) یـان ئەگـەر (Disposable) بـوو ڕەوانـەی یەکـەی پاشماوە پزیشکیەکان (نفایات طبیة) لە نەخۆشخانە بکرێـت و هێمـای مەترسـیان لەسـەر دابنرێت پاشان لەناوببرێت.
- ❖ پشکنینی هەوکردنی ڤایرۆسی جگەر جۆری (HIV ، B, C) بۆ هەموو ئەو نەخۆشانەی نەشتەرگەری سارديان بۆ دەکرێت پێش ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکە. .
- ❖ دەبێت تیمی نەشتەرگەری پێش ئەنجامـدانی نەشـتەرگەری سـێ ژەم کوتـانی هـەوکردنی ڤایرۆسی جگەری وەرگرتبێ (ژەمی یەکەم یان سفر دواتر ژەمی دووەم پاش مانگێکە و ژەمی سێیەمیش پاش پینج مانگ مانگ دوای ژەمی دووەم.
- ❖ بـەڵام ئەگـەر ئـەو ماکوتانـەیان وەرنـەگرتبێ ئـەوا بـۆ خۆپاراسـتن دەبێـت ژەمـی یەکـەمی کوتان و سـیرەمی خـوێن (HBIG)Hepatitis B Immunoglobulin وەربگرێـت لە کاتێك دا ئەگەر گومانی هـەبووی هـەوکردنی ڤایرەسـی لێـدەکرا کەیسـەکە وە سـتافەکە بەرکەوتەی نەخۆشەکەبوون .
- ❖ سیرەمەکەش HBIG بە بڕی بۆ گەورە ب (0.06ml ) بۆ هەر ۱ کگم لە کێشی کەسـەکە واتە نزیکەی (۳ – ۵ مل) بۆگەوران . لە ماوەی (24) کاتژمێری بەرکەوتنەوە دەدرێت .

❖ دەبێت هەموو ئەو کەرەستە و ئامراز و پێداویستیانەی کە بۆ نەشتەرگەری بەکاردێن پاش ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکە زۆر جوان پاکژ بکرێنەوە ئەمەش بە پێی جۆری پێکهاتەی ئەو کەلوپەلانە:

✓ ئەو ئامێرانەی کە ستیلن دەبێت بە ئۆتۆکلەیف (Autoclave) لە بۆ ماوەی (١٥ خولەك ) لەپلەی گەرمی (١٢١ سەدی) پاکژ بکرێن ، ئەوانەش کە شووشەن دەبێت پاشان بە گیراوەی کلۆر یان هەر گیراوەیەکی باوەرپێکراو بۆ پاکژکردن یان لەناوبردنی فایروسەکان بەکاربێت پاکژبکرێن.

✓ ئەو پارچانەی لە هەناسەدانی نەخۆش بەکار دێن و دەنووسێن بە دەم ولووتی نەخۆشەوە باشتر وایە(Disposable) بێت یاخود بە جوانی بە گیراوەی کلۆر پاك بکرێنەوە.

✓ ئەو لوولانەی لە سڕکردن بۆ هەناسەدانی نەخۆش بەکاردێن دەبێت فلتەری بەکتریا و ڤایرۆسی بۆ بەکاربهێنرێت.

✓ تا بتوانرێت کەرەستەو کەلوپەلی دیسپۆزەبل بەکاربهێنرێت ، پاشماوەکانیش لە ناو کورەی سوتان (محرقة) بسووتێنرێن.

١. لە کاتی هەڵسوکەوت کردن لە گەڵ نەخۆشەکە دەبێت دوو جووت پەنجەوانە پێکەوە لە دەست بکرێن .

٢. دەبێت چاویلکەی خۆپارێزی لە ناو کەلوپەلەکانی خۆپارێزی کارمەندانی هۆڵی نەشتەرگەریدا هەبێت .

٣. پێویستە هەر کەسێك پێڵاوی تایبەتی خۆی هەبێت یان هەروەها (Over shoes ) بەکاربهێنێت لە هۆڵی نەشتەرگەریدا.

٤. دەبێت کڵاو CAP لەسەر بکرێت.

٥. ئەو دەمامکەی (ماسك) بەکاردێت پێویستە توانای پاڵاوتنی بەرزی هەبێت و لەو جۆرانەش بێت کە یەکجار بەکار دەهێنرێن (Disposable)

٦. پۆشاکی (gown ) نەشتەرگەری پاکژ بە ژمارەی پێویست بۆ هەموو ئەندامانی تیمە تەندروستی و یاریدەدەرەکانیان هەبێت کە بتوانن لە کاتی پێویستدا بیگۆڕن.

● پاش ئەنجامدانی نەشتەرگەری دەبێت ژووری نەشتەرگەری بەجوانی و بە گیراوەی کلۆر بشۆرێت هەروەها ئەو ئامێرانەش کە ژوورەکەی پێ پاکژ دەکرێنەوە دەبێت بنێردرێن بۆ ژووری پاکژکاری (غرفة التعقیم) بە مەبەستی شووشتنی بەگیراوەی کلۆر یان هەر گیراوەیەکی باوەرپێکراو بۆ پاکژکردن یان لەناوبردنی فایروسەکان بەکاربێت .

- پاش خاوێن کردنەوەی ئەرزەکە بە فلچە (ماسحة)دەبێت بنێردرێت بۆ یەکەی پاکژکاری (وحدة التعقیم ) بۆ پاککردنەوەی ( تطهیر ) بە کلۆر یان هەر لە جێگەی خاوێنکردنەوەکە لە هۆڵی نەشتەرگەری بکرێتە ناو کلۆر باشتر وایە بە تەواوی خۆمانی لێ ڕزگار بکەین.
- ئەگەر بە هۆی نەشتەرگەریەوە پریشکی خوێن و دڵۆپی خوێن ڕژایە سەر هەر جێگەیەك ئەوا دەبێت بە گیراوەی کلۆر جوان خاوێن بکرێتەوە. پێویستە هەوڵی کۆنترۆڵکردنی بڵاوبوونەوەی دڵۆپی خوێن بدرێت.
- دەبێت یەکەی پاکژکاری ( وحدة التعقیم ) ئاگادار بکرێتەوە لە مەترسی ، لە کاتی ناردنی ئەو ئامێرانەی پێویستیان بە پاکژکردن هەیە و دەبیت بخرێنە ناو کیسی سوورەوە (دوو کیسە لەناو یەکدی) .
- پاشماوەی نەشتەرگەیەکە لە شاش یان گۆزی پیسبووی تایبەت بە نەخۆشەکە و کەلوپەلی خۆپارێزی بەکارهاتوو هەمووی لە ناو کیسێکی سوور دابنرێن بنێردرێن بۆ ژووری پاشماوەی پزیشکی ( نفایات طبیة ) بۆ سووتاندی.
- دەبێت خۆمان ڕزگار بکەین لەو کەلوپەلانەی لە نەشتەرگەریەکە زیاد بوونە وبەکار نەهاتوون.
- دەبێت هەموو ئەوکەلوپەلانەی پێویست نین بۆ نەشتەرگەریەکە لە ژووری نەشتەرگەری لابرێن.
- دەبێت هەموو ئەو لوولە سۆندانەی کە بۆ دەرکێشانی شلەکانی ناو ڕێڕەوەکانی هەناسەدان بەکاردێن (دیسپۆزەبل) بن (Disposable) بەڵام ئەگەر ئەو لوولانە شووشەبوون پێویستە بە مادەی کلۆر پاکژ بکرێنەوە.
- پێویستەلارینجۆسکۆپ Laryngoscope ( المنظار الحنجری ) بە ئۆتۆکلەیف بەبێ گڵۆپەکەی پاکژبکرێتەوە یان بکرێتە ناو گیراوەی (سیدکس) بۆماوەی( ٢٠ ) خولەك .
- پێویستە نەخۆشەکە دوایی هەموو نەخۆشەکانی تر نەشتەرگەری بۆ بکرێت (واتە لە کۆتا کەیس بێت بۆ داخستی هۆڵی نەشتەرگەری )
- دەتواندرێت هەر پاکژ کەرەوەیەك بەکار بێت کە بکوژی ( Hepatitis B.C.HIV ) بێت لە جیاتی پاکژکەرەوەی کلۆر .

ئەو پێداویستیانەی کە پێویستە لە ژووری نەشتەرگەری هەبن:

**پێویستیەکانی پاکژکاری :**

- مادەی پاکژکاری وەکو بێتادین بە بڕی پێویست بۆ ماوەی یەك هەفتە لەبەر دەستدا بێت.
- ئاوی گەرم و سابونی شل
- دەستەسڕی پاکژ بۆ ووشك کردنەوە.

**ئامێری پێویست:**

- ئامرازی پێویستی نەشتەرگەری تایبەتمەند بە پێی جۆری نەشتەرگەری و تەمەنی نەخۆش کە بەشی دوو ڕۆژ بکات
- خاوێنکەر و کەرەستە و مەوادی پێویستی پاکژ
- کیسە نایلۆنی پێویست و پێداویستیەکانی دیکە

**زانیاری**


د.ابراهیم طاهرمعروف / پزیشکی پسپۆری تەندروستی کۆمەڵ
بەرپرسی بەشی نەخۆشیە ڤایرۆسیەکان (زایندیەکان)
Dr_ibrahim959@yahoo.com ٠٧٥٠٤٦٨٥٦٠٦

شوان کانبی / پسپۆری پاراستنی تەندروستی کۆمەڵ
لیپسراوی هۆبەی هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی
shwankanabi@yahoo.com / ٠٧٥٠٧٤٨٧٤٠٧

# ناوەڕۆك